زنجیرەی ٢٤

### کورد لە گۆڕانکارییە نوێیەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست

# سروشتی پەیوەندیەکانی (ئەمریکا و تورکیا و ئێران) کاریگەری بەسەر کوردستان






کورد لە گۆڕانکارییە نوێیەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست

# سروشتی پەیوەندیەکانی (ئەمریکا و تورکیا و ئێران)
# کاریگەری بەسەرکوردستان

**ئامادەکردنی**

ناوەندی توێژینەوەی دەزگای ستاندەر
بۆ ڕاگەیاندن و توێژینەوە




**www.skurd.net**

**info@skurd.net**

# سروشتی پەیوەندیەکانی (ئەمریکا و تورکیا و ئێران)
# کاریگەری بەسەر کوردستان

**توێژینەوەی:** سروشتی پەیوەندیەکانی (ئەمریکا و تورکیا و ئێران) کاریگەری بەسەر کوردستان

**ئامادەکردنی:** ناوەندی توێژینەوەی دەزگای ستاندەر

**توێژینەوەی تایبەت ژمارە (24):** بۆردی توێژینەوە دەزگای ستاندەر سەرباری توێژینەوەکانی خۆی توێژینەوەی

**شوێن و ساڵی بڵاوکردەنەوەی:** هەولێر - 2018





# ناوەڕۆک

# پێشەکی

ئێستا زیاتر لە جاران پەیوەندییەکانی (ئەمریکا، تورکیا و ئێران) ڕوو لە خراپی و ئاڵۆزییە، ئەوەی تازە بێ لەو گۆڕانکاریانە بریتیە لە، سزای ئابووری بەسەر (تورکیا و ئێران) وەک بەشێک لە سیاسەتێکی نوێی جیهانیی کە پێی دەڵێن: (ارغام دون الحرب)، ئەو جۆرە سیاسەتەش دیزاینێکی نوێ لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دروست دەکات، کاریگەرییەکی قووڵیش لەسەر پێگەی کورد و کوردستان دروست دەکات، بەهەردوو ئاڕاستەی (ئەرێنی و نەرێنی) لەم ڕاپۆرتە ستراتیژییە هەوڵدەدەین هەندێک لایەنی ئەو کاریگەریانە لە ئێستاوە پیشان بدەین، بۆ ئەوەی کوردستان لە لایەنە ئەرێنییەکان سودمەند بێت و خۆشی لەلایەنە نەرێنییەکان بپارێزێت.

ئەو توێژینەوە لە سێ بەشی سەرەکی پێکهاتووە، بەشی یەکەم/ باس لە بەرپابوونی پەیوەندی ئەمریکا و تورکیا دەکات، لەم بەشە ریشەی ناکۆکی نێوان ئەمریکا و تورکیا ڕوونکراوەتەوە. بەشی دووەم/ سیاسەتی نوێی ئەمریکا (بنەمای ترامپیزم - Trumpism) و کاریگەری (ناکۆکیەکانی ئەمریکا لەگەڵ تورکیا و ئێران) لەسەر کورد شیکراوەتەوە، لەم بەشە هاوکێشە ستراتیژیەکانی ئێران و تورکیا سەبارەت بە کورد خراوەتە ڕوو، هەر لەم بەشەدا، دروستبوونی هەڵوێستی سیاسەتی ئەمریکی لە ڕێگەی سیاسەتی تورکیا تا کوردستان باسکراوە. بەشی سێیەم/ تێنەگەیشتنی سەرکردایەتی (کوردی باشور) لە ستراتیژییەکانی ئەمریکا و هەروەها ئاسۆی ناکۆکیەکانی (ئەمریکا و تورکیا و ئێران) و چارەنوسی کوردستان شیکراوەتەوە.

لەم توێژینەوەیەدا کاریگەری پەیوەندی (ئەمریکا و تورکیا و ئێران) بەسەر کوردستان بەگشتی وەرگرتووە، بەڵام چەقی ئەو کاریگەییە بەسەر باشوری کوردستان دیارکردووە. هەروەها مەبەست لە (سەرکردایەتی کورد) هەموو ئەو بەرپرس و دەسەڵاتدارە حیزبی و حکومییانە دەگرێتەوە کە لە سەنتەری بڕیارن و دەسەڵاتبەدەستن.

# بەشی یەکەم

## تەوەری یەکەم

# بەرپابوونی پەیوەندییەکانی ئەمریکا و تورکیا

جاران ئەمریکا ڕۆڵێکی وای نەبوو لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەتایبەتی بە پیادەکردنی (بنەمای مۆنرۆ ١٨٢٣)، بەریتانیا زیاتر ئەو ڕۆڵەی دەبینی، بەتایبەت ئەم ڕۆڵە یەکجار زیاتر بوو لە کۆتایی سەدەی نۆزدە لە سەردەمی حوکمڕانی عوسمانییەکان، تا ئەو ڕادەیە گەلێک جار والییەکانی عوسمانی بە بۆچوونی بەریتانیا دیاری دەکران، لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم (١٩١٤- ١٩١٨) عوسمانییەکان (کە چوونە پاڵ وڵاتانی تەوەر) دۆڕان و شکستیان هێنا، لە ١٩١٨/١٠/٣١ شەڕ وەستا، وەستانی جەنگی سەرانسەریش لە سەعات (١١)ی رۆژی ١٩١٨/١١/٣٠ بوو، بۆ هەریەکە لە وڵاتانی دۆڕاویش کۆنگرەی تایبەتی سازکرا، بەم شێوەیەی خوارەوە:

_ کۆنگرەی (فرسای) بۆ ئەڵمانیا لە ١٩١٩/٧/٢٨.

_ کۆنگرەی (سان جرمان) لە ١٩١٩/٩/٣٠بۆ نەمسا.

_ کۆنگرەی (نوێ) لە ١٩١٩/١١/٢٧بۆ بولگاریا و مەجەر.

_ کۆنگرەی (رابۆلۆین) لە ١٩٢٠/١١/١٢بۆ ئیتالیا و یۆگوسلاڤیا.

_ کۆنگرەی (ریگ) لە ١٩٢١/٣/١٨ بۆپۆلۆنیا..

_ کۆنگرەی سیڤەر تایبەتە بە عوسمانییەکان کە لە ١٩٢٠/٨/١٠ بەسترا.

کۆنگرەی (سیڤەر) پێکهاتبوو لە (433) مادە، نوێنەری عوسمانییەکان (جەنەراڵ هادی پاشا و رەزا تۆفیق بەگ) بەشداربوون و سیڤەریان مۆر کرد. لە مادەی (٢٧) تا مادەی (٦١) ئاسۆی دەوڵەتێکی نوێ لەجیاتی (عوسمانی) دیاری کرا، بنەمای (١٠ و ١٢)ی چواردە خاڵەکەی ویلسونی ١٩١٨ سەبارەت بە تورکیا بوو لەجیاتی عوسمانی، هەرە دوایش بەپێی مەرجەکانی لۆزانی ١٩٢٣ دروست بووە، لە مادەی (٩٤)ی سیڤەر دان بەو وڵاتانەی وەکو (عێراق و سوریا و حیجاز و کوردستان..) هێنرا لەلایەن عوسمانییەکانەوە، دەوڵەتی (تورکیای نوێ) لەسەر دەستی ئەتاتورک لە ئەنقەرە بینا کرا و دەستی کرد بە سەودا و رێککەوتن و چارەسەری کێشەی سنورەکان، لە ١٩٢١/٣/١٣ لەگەڵ ئیتاڵیا رێککەوتن، لە ١٩٢١/٣/١٦ قرمی دا بە روسیا، لەگەڵ فەرەنسا لە ١٩٢١/١٠/٢٠ رێککەوتن و کلیلکاشی دا بە فەرەنسا، لە ١٩٢٠/٥/٣٠ لە هەمان کاتدا بە مادەی (٢٢)ی (عوسبەتول ئومەم) و مەرجەکانی ئینتدابی لەسەر میراتەکانی قایل بوو، لەدوای دەسەڵات گرتنە دەستی محافزکارەکانی بەریتانیا لەساڵی ١٩٢٢، بەریتانیا هەڵوێستیان گۆڕا و لە ١٩٢٢/١٠/١١ بەریتانیا و ئەتاتورک رێککەوتنێکی نوێیان مۆرکرد، لە ١٩٢٤/٣/٣ ئەتاتورک بەفەرمی دەوڵەتی (عوسمانی) هەڵوەشاندەوە. کۆنگرەی لۆزان کرا کە پێکهاتبوو لە (١٤٣) مادە و (١٢٨) جار ناوی تورکیای تێدا هاتبوو، ناوی دەوڵەتی عوسمانی نەماو نەیانهێشت وەفدی عوسمانی بەشداری بکات، کەمال ئەتاتورک دەستی بەچاکسازی مەدەنی کرد بە پێوانەی رۆژئاوا:

١- لە ١٩٢٠/٧/١ یاسای (جینائی) هێنایە جێی سنورە شەرعیەکان.

٢- لە ١٩٢٢/١١/١ سەڵتەنەتی هەڵوەشاندەوە و سوڵتان محەمەد واحدالدین دەرکرا.

٣- لە ١٩٢٢ پایتەخت لە ئەستەمبۆڵەوە گواسترایەوە بۆ ئەنقەرە.

٤- لە ١٩٢٣/١٠/٢٩ خەلافەتی وەرچەرخاندە سەر کۆماری و ئەتاتورکیش بووە سەرکۆمار.

٥- لە ١٩٢٤/٣/٣ خەلافەت هەڵوەشێنرایەوە.

٦- لە ١٩٢٤/٤/٢٨ دادگا شەرعیەکانی هەڵوەشاندەوە.

٧- لە ١٩٢٤/١٠/٤ یاسای مەدەنی سویسری بەسەر تورکیا پیادە کرد.

٨- لە ١٩٢٨/٤/١٠ ماددەی (ئایینی فەرمی دەوڵەت ئیسلامە) بەیەکجاری لە دەستوری تورکیا (ئەنایاسا) لادرا.

٩- لە ١٩٢٨/١١/١١ پیتە ئیسلامیەکان(ئەلفا_بێی عەرەبی)یان یاسایتر بڵێین پیتە عوسمانیەکانی گۆڕی بۆ پیتی لاتینی.

تا جەنگی جیهانی دووەم ئەو پەیوەندیەی (رۆژئاوا و تورکیا) لە ئەستۆی بەریتانیا و فەرنسا بوو، دواتر نۆرەی ئەمریکا دێت. سەرەتای پەیوەندیەکان دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم، (تورکیای_نوێ) هەوڵیدا سود لە (مەترسی بەلشەفیەت) وەرگرێت و پێگەی خۆی لای رۆژئاوا بەهێز بکاتەوە، لەسەرەتادا (روسیای_بەلشەفی) بەسەرۆکایەتی (لینین) پشتی تورکیای گرت و یەکەم کۆبونەوە لە١٩١٩/٦/٢١ لە نێوان (ئەتاتورک و سیمن بودێنی) گرێدرا بۆ یارمەتی سەربازی تورکیا، لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم وەك زلهێزێك بەریتانیا کەوتە پاش و ئەمریکا هاتە پێش. میساقی ئەتڵەسی لە ساڵی١٩٤١ لە نێوان رۆزفلتی سەرۆکی ئەمریکا و چەرچلی سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا مۆرکرا، کە گوزارشت لەو وەرچەرخانە دەکات، لە جەنگی جیهانی دووەم تەواو ئەو وەرچەرخانە ڕوویدا، کاتێك شەڕ کەوتە نێو ئەوروپا بۆ دوو جەمسەری جیهانی، بەڵام لەلایەن دوو هێزی دەرەوەی ئەوروپا (سۆڤیەت و ئەمریکا) یەکلایکرایەوە، لەوە زیاتر بالوێزی بەریتانیا لە 21ی فرایری 1947 یاداشتێکی فەرمی پێشکەشی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا (مارشاڵ) کرد، بەفەرمی مەلەفی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی پێشکەشی ئەمریکا کرا، واتە کۆتایی بە رۆڵی بەریتانیا لەو ناوچەیە هات. دواتر سۆڤیەت و ئەمریکا هەم بوونە دوو جەمسەر و هەم جەنگی ساردیش دەستی پێکرد، ئیتر لێرەوە پەیوەندییە تایبەتیەکانی تورکیا و ئەمریکا دەست پێدەکات، تورکیا لەجەنگی جیهانی دووەم سەنگەری گواستەوە بۆ لای هاوپەیمانان، لەو کاتە سۆڤیەت هەندێ جموجۆڵی سەربازی لە نزیک تورکیا هەبوو، وای کرد بنەمای ترومانی ساڵی (١٩٤٧) دەرچێت بۆ پارێزگاری لە ئاسایشی تورکیا، یارمەتی سەربازی دەستی پێکرد، لەساڵی ١٩٥٧ تورکیا پابەندی خۆی بە (بنەماکانی ئایزنهاوەر) ڕاگەیاند لەگەڵ ئێران و ئیسرائیل دژ بە جموجوڵی شیوعیەت

لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، هەنگاوی گەورەی تورکیا بە دڵی ئەمریکا ئەوەبوو لە ١٩٤٩/٣/٢٨ (عیسمەت ئینینۆ) پەیوەندی لەگەڵ ئیسرائیل دروست کرد و دانی بە ئیسرائیل هێنا، لە چوارچێوەی جەنگی سارد تورکیا بەتەواوی لەبەرەی ئەمریکا بوو، لەساڵی ١٩٥٢ تورکیا چووە ناو (هاوپەیمانی ناتۆ) لە دژی (هاوپەیمانی وارشۆ) بەسەرۆکایەتی سۆڤیەت، هەروەها تورکیا لەساڵی ١٩٥٥ چووە (هاوپەیمانی سەنتۆ)، لەسالی ١٩٥٩ داوای ئەندامێتی یەکێتی ئەوروپای کرد، لە ساڵی ١٩٦٣ تورکیا لە (شراکة اقصادیة)ی ئەوروپا وەرگیرا، ئەو پەیوەندییە گەرم و ستراتیژییە بوو (لەگەڵ ئەوەی جارجار ساتمەشی تێدا بوە) تا کۆتایی جەنگی سارد، ئیتر نۆرەی قۆناغیکی تر دێت لەو پەیوەندییە، بەرە بەرە ناکۆکیەکان سەریان هەڵدایەوە و نۆرەی تەوەرەی دووەم دێت .

## تەوەری دووەم

# ڕیشەی ناکۆکی نێوان ئەمریکا و تورکیا

لە دوای جەنگی سارد جیۆپۆلیتیکی تورکیا کەوتە هەژان، ئەو نازەی نەما، ئەوەی کەمێک هێزی پێیدایەوە شۆڕشی ئیسلامی ئێران بوو کە لە ساڵی ١٩٧٩ هاتەکایەوە و لەگەڵیدا ڕابوونی ئیسلامیش لەناوچەکە پەرەی سەند. تورکیا هەوڵیدا ئەو فاکتەرە بکاتە جێگرەوەی (گرنگیەکەی پێشوو دژ بە سۆڤیەت)، ڕێککەوتنێکی نوێی (ئەمریکی و تورکی) لە ١٩٨٠/١/١٠ مۆر کرا، یارمەتیەکانی سەربازی ئەمریکی لە (٤٠٠) ملیۆنەوە بووە (٩٣٤) ملیۆن دۆلار، بەڵام بەهۆی کێشەی کورد تورکیا نەیتوانی وەک پێویست بچێتە بەرەی دژی ئێران، زیاتر لەوەش لە ساڵی ٢٠١٠ تورکیا دژی گەلاڵەکەی ئەمریکیان بۆ ئەنجومەنی ئاسایشی (UN) وەستان، سەبارەت بە سزاکانی سەر ئێران، لەبەرامبەردا ئەمریکاش نەیهێشت تورکیا ببێتە ئەندامی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان و تەنها (٦٠) دەنگی لەکۆی (١٩٣) هێنا.

**پەیوەندی (تورکیا و ئەمریکا) ساردی تێکەوت بەتایبەتی لە دوای:**

١- سەرهەڵدانی ڕەوتی ئیسلامی لە ناو تورکیا و دوایش گەیشتنیان بە دەسەڵات.

٢- پێویستی تورکیا بەهاریکاری ئێران دژ بەبزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد.

مەرجەکانی یەکێتی ئەوروپی بۆ وەرگرتنی تورکیا هەر زیادی دەکرد و کەوتە قۆناغێکی تر، لەساڵی ١٩٩٧ دوای ئەوەی قوبرس بوو بە ئەندامی یەکێتی ئەوروپا، ئەم ئەندامبوونەی قوبرس تورکیای هەژاند و ڕووبەڕووی چەندین قەیران بوویەوە، هەر

لەبە ئەمە تورکیا تا ڕادەیەک ڕووی لەکاروباری رۆژهەڵاتی ناوەراست کرد، بەتایبەتی لەگەڵ ئیسرائیل چەند ڕێککەوتنامەی سەربازی و ئەمنی مۆرکرد، گرنگترینیان پەیماننامەی مانگی ٢ی ١٩٩٦ کەخۆی لە (١٦) ڕێککەوتن دەدۆزیەوە، هەروەها لەدوای جەنگی جیهانی دووەم تورکیا بۆ یەکەمجار هێزی دووبارە ناردەوە دەرەوەی سنور، بەتایبەت بۆ لبنان و سۆمال و کوردستانی باشور، بەپێی رۆژنامەی (حریەتی تورکی-رۆژی ١٩٩٤/٧/٦) یەکەمجار مام جەلال پێشنیاری بۆ تۆرگۆت ئۆزاڵ سەرۆك کۆماری تورکیا کردبوو، کە لە دابەشبوونی عێراق سوودمەند دەبن بەوەی کۆنفیدراڵیەک لەگەڵ هەردوو (کوردستانی باشور و باکور) پێکبهێنن، دیارە هەندێک سەرکردەی تریش ئەو پێشنیارەیان بۆ تورکیا کردبوو، بەپێی هەندێک سەرچاوەی تر ئەو گەڵاڵەی مام جەلال بۆ تورکیای دابوو ئەوەبوو دانوستان لەگەڵ پەکەکە بکات و ئەوەندە هەستیاریش نەبێت لەگەڵ باشوری کوردستان، تا ڕادەیەکی باش سەرکەوتو بوو، پێشووتر کورد هەوڵی لەو شێوەیەی داوە لە بەڵگەنامەی ئەمریکی (بروسکەی ژ:٤٩)ی باڵوێزخانەی ئەمریکی لە بەغدا بۆ وەزارەتی دەرەوە لە١٩٦٢/٩/٢٠، کە " مەلا مستەفا پێشنیاری بۆ شای ئێران کردووە کوردستانی دیوی عێراقیش بە ئێران بلکێندرێت و کوردستانێکی یەکگرتووی خودموختاری دروست بێت".

لەو دواییە تورکیا هێزەکانی بۆ سوریا و قەتەریش نارد، هەرچەندە پێشووتر لە سەردەمی (ئەحمەد داود ئۆغلو) تیۆری (سفر) هاتە کایەوە لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ، لەلایەکی تریش زۆر لە بنەماکانی ئەتاتورک پاشەکشەی کرد بێ ئەوەی جاڕی بدەن، ئەوانە هەموو خۆئامادەکردنی تورکیا بوو بۆ ئەوەی هێز و وزەی نێودەوڵەتی بەخۆی ببەخشێ بۆ گرنگی تورکیا و لەدەستنەدانی ستراتیژییەتی ناتۆ و ئەمریکا بۆ تورکیا، واتە تورکیا بەدوای سیاسەتێکی بەدیلی ئەمریکا دەگەڕا زۆر ئاساییە تووشی ناکۆکی لەگەڵ بێت.





## وێستگەکانی ناکۆکی ئەمریکا و تورکیا

گۆڤاری (فۆرن پۆلس) هۆکاری کێشەکانی نێوان واشنتۆن و ئەنقەرە دەگێڕێتەوە بۆ سێ خاڵی سەرەکی (پرسی کورد - کێشەی قەشە برونسەن - نزیک بونەوەی ئەردۆگان لە ڕوسیا )، بەڵام بەپێی ئەو توێژینەوەیەی لەبەردەستتدایە ڕیشەی ناکۆکییەکان درێژترە، بەم شێوەیەی خوارەوە :

١. دوای ڕێککەوتنی دوو قۆڵی نێوان (ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت) لە ساڵی ١٩٦٢ لە ئەنجامی قەیرانەکانی کوبا، ئەمریکا بێ پرسی تورکیا موشەکەکانی (جۆپیتەر)ی کێشایەوە، کە سەرە نوکەکانی موشەکی ناوەکی هەڵگرتبوو، ئەمەش بووە هۆی توڕەبوونی ئەو وڵاتە و بووە سەرەتای ناکۆکیەکانی نێوان تورکیا و ئەمریکا.

٢. لە ساڵی ١٩٧٤ ئەمریکا سزای کڕینی چەکی بەسەر تورکیا سەپاند، بە هۆی لەشکرکێشی تورکیا بۆ سەر قوبرس، لە بەرامبەردا تورکیا بەکارهێنانی بنکەی ئەنجەرلیکی لە ئەمریکا قەدەغە کرد. کە دەکەوێتەوە باشوری ئەدەنە، تورکیا دەستی گرت بەسەر بنکە سەربازییەکە.

٣. پەرلەمانی تورکیا لە ١/٣/ ٢٠٠٣ دژی پرۆسەی ڕووخاندنی ڕژێمی بەعس وەستا لەسەر دەستی ئەمریکا، ئیتر تورکیا ڕێگری کرد لە بەکارهێنانی بنکەی ئەنجەرلیک و خاکی وڵاتەکەی بۆ هێرشکردنە سەر عێراق، هەرچەندە لەجەنگی دووەمی کەنداو (سەردەمی ئۆزال) تورکیا یارمەتیدەرێکی ئەکتیڤی هاوپەیمانان بوو، ئەم کارە وای لێخوێندرایەوە کە پەرلەمانتارانی (داد و گەشە) لەپشت ئەو مەنگاوە بن .

٤. بەگشتی ئایدیۆلۆژیای (تورکیای نوێ) لەگەڵ سیاسەتی گشتی ئەمریکا و ڕۆژئاوا ناگونجێت، بە پێی (تقرير ستراتيجى الامن القومى الامريكى ) ساڵی 1997 (واتە لەدوای ڕووخانی سۆڤیەت) دیسان تورکیا بۆ ئەمریکا بە گرنگ وەسف کراوە، مادام (دولة تركية ديمقراطية علمانية تغريبية) بێت، ئەو گۆڕانکاریەی تورکیا لەعەلمانی بەرەو ئاینی تا لای ئۆباماش ئاسایی بوو، بەڵام لای ترامپ زۆر نائاساییە، بە تایبەتی لەدوای

ئەوەی دانیشتنی ریاز (ترامپ - شای سعودیە) تیایدا (٤٨٦) ملیار دۆلار و چەند لیستێکی ناوی بزوتنەوە ئیخوانییەکانی پێدرا بۆ لیستی تیرۆر.
( زیاتر بڕوانە: توێژینەوەی بروکنجز: هل ينبغي إعلان "الإخوان المسلمين" منظمة إرهابية)

٥. ناکۆکی نێوان (تورکیا و ئەمریکا) لە کێشەی سوریا. دوای ئەوەی ئەمریکا لە سوپای سوریای ئازاد بێ ئومێد بوو، پشتیوانی لە هێزەکانی رۆژئاوای کوردستان بەتایبەتی لە پرۆسەی رزگارکردنی شاری کۆبانێ لە ساڵی٢٠١٤ کرد، دواتر پشتیوانی شاری ڕەقە و شوێنەکانی دیکەی کرد، کە بووە هۆی ئەوەی تورکیا بە تەواوی دژایەتی سیاسەتی ئەمریکا لە سوریا بکات. یارمەتی ئەمەریکا بۆ کوردەکانی رۆژئاوا، ئەردۆغانی تورەتر کرد، گەیشتە ئەو ڕادەیەی تورکیا داوا بکات یان ئێمە هەڵبژێرن یان یەپەگە .

٦. لە کودەتاکەی ساڵی ٢٠١٦ ئەردۆغان لە وتارەکانی دەستیکرد بە هێرشکردنە سەر ئەمەریکا و رۆژئاوا و بە هۆکاری ئەنجامدانی "کودەتاکە" تۆمەتباری کردن. لە هەمانکاتیشدا (فەتحوڵا گولەنی) تۆمەتبار کرد و داوای دەکرد ئەمریکا تەسلیمی بکاتەوە .

٧. نیگەرانی و تورەیی ئەمریکا لە تورکیا کە سپیکردنەوەی پارەی بۆ ئێران کردووە.

٨. گۆڕانکارییە دیموکراسییەکانی تورکیا کە بەرەو سیستەمێکی تاکرەوی دەبات.

٩. سیاسەتە ئابوورییەکانی واشنتۆن و ئەنقەرە کێشەیان هەیە.

١٠. کۆنگرێسی ئەمریکا لە ٢٠١٨/٧/٢٤ ڕێگری کرد لەوەی فرۆکەی F35 بە تورکیا بدرێت.

١١. کۆمەڵێک ناکۆکی تریش هاتە کایەوە، لەوانە بڕیارەکەی کۆنگریس لەبارەی (جینۆسایدی ئەرمەنەکان) و مافی مرۆڤ و کەمایەتییەکان لە تورکیا، تازەترینیش ڕووداوەکەی (قەشە ئەندرۆ)یە کە بەتۆمەتی"هەبوونی پەیوەندی لەگەڵ بزاوتی خزمەتی فەتحوڵا گولەن و پارتی کرێکارانی کوردستان (پەکەکە) دەستگیر کراوە.

هاوکات ئیدارەی ترامپ ئاماژە بەوە دەکات، کە کێشەی ئێمە تەنیا بە ئازادکردنی قەشە (ئەندرۆ برۆنسن) کۆتایی نایەت، ئەمەش وەک ئاماژەیەک بەوەی کە ئەمریکا و تورکیا چەندین کێشەیان هەیە لە رووی سیاسی و ئابووری سەربازی، بۆ نموونە (Amanda Sloat) لە وتارێکی دا لە رۆژنامەی (Foreign Affairs) دەڵێت: "سەرچاوەی کێشەکانی تورکیا و ئەمریکا ئامانجی تورکیایە بۆ گەڕاندنەوەی دەسەڵات و ئەو هەیمەنەیەی هەیبوو لە ڕابردوو".

هەروەها بەشێک لە لێکۆڵەران ئاماژە بەوە دەکەن، کە ئەمریکای ئیدارەی ترەمپ لەو باوەڕەدان بۆ ئەوەی سلوکی سیستەمی سیاسی ئێران بگۆڕێت، پێویست بە فشار خستنە سەر تورکیا دەکات، چونکە تورکیا پاڵپشتێکی بەهێزی ئابوری و سیاسی ئێرانە، بۆ نموونە/ نزیکەی نیوەی غازی سروشتی ئێران لە لایان تورکیا هاوردە دەکرێت.

سەڕای ئەوانەش تا ئێستاش ئەمریکا و ڕۆژئاوا جۆرە تاکتیکێک لەگەڵ تورکیا بەکاردێنن بۆ ئەوەی بەیەکجاری لەدەست خۆیان دەرنەچێت، کاتێک تورکیا لەگەڵ ئەوروپا نێوانیان ناخۆش دەبێت، ئەمریکا ساردی دەکاتەوە، کاتێک ئەمریکا گەرمی دەکات ئەوروپا ساردی دەکاتەوە، ئێستا ئەوروپا ئەو ڕۆڵە دەبینێت.

دوو کێشەی تری جەوهەری هەیە (پەیوەست بەو توێژینەوە) کە هەڵوەستەی دەوێت، یەکەمیان سیاسەتی نوێی ئەمریکی (ترامپیزم)، دووەم کێشەیەکی تر لەبارەی کوردە، کە ئەوەیان لە تەوەری سێیەم باسکراوە.

## مناوەراتی تورکیا

تورکیا نایەوێت لە ناوخۆ بەو شێوە دەرکەوێت کە تەنازول بۆ ئەمریکا دەکات، وای پیشانداوە کە ئەردۆگان هەر سەرکەوتووە، هەوڵیدا جۆرە مناوەرە و گوریس کێشکانییەك بکات لەگەڵ ئەمریکا و ئینجا ڕێکبکەون، بەڵام ترامپ ئەو جۆرە سیاسەتە ناکا، تورکیا هەوڵیدا لەبەرەی روسیا و ئێران نزیك بێتەوە بۆ ئەوەی نازی





لای ئەمریکا زیاد بکات، سەرکەوتو نەبوو، ئەو سەودا سەربازیانە و کڕینی موشەکی ڕووسی زیاتر زیانی بە پەیوەندییەکان گەیاند، بووە هۆی وەستانی فرۆشتنی فرۆکەی F35ی ئەمریکی بۆ تورکیا، ئیستا سەبارەت بە پرسی سوریا تورکیا کەوتە ئاراستەی ئەستانە و روسی و ئێرانی، کە شکستیان بە ئاراستەی جنێف هێنا کە ئەمریکایی بوو. لەبارەی کوردیش تورکیا زۆر هەوڵیدا (لەچوارچێوەی سیاسەتی ئیحتوا) ئەمریکا لە هەموو پارچەکانی تری کوردستان دوور بخاتەوە، تەنها لە باشوری کوردستان لەو سیاسەتە سەرکەوتوو بوو، بەڵام دوای ریفراندۆم لەوێش ئەو سیاسەتەی تووشی شپرزە بوویەوە، لەرۆژئاڤا هێزی هێنا و مناوەرەی پڕ مەترسی لەگەڵ ڕێکخراوی داعش و بەرەی نوسرە و ئەحرار کرد، ویستی بۆ ئەمریکا ببێتە بەدیلی هێزەکانی سوریای دیموکرات، بێگومان سەرکەوتوو نەبوو. تا ئەو ڕادەیە، تورکیا مەیدانخوازی لە ئەمریکا خواست کە نابێت هەردوو لامان هەڵبژێریت (کورد یان تورکیا ) ئێمە یان ئەوان. تورکیا وای زانی بەو داوایە ئەمریکا بۆ تورکیا یەکلایی دەبێتەوە واز لە کورد دەهێنێت، لەوەش سەرکەوتوو نەبوو، چەندین مناوەراتی تری کرد وەك پێویست نەهاتە دی. لە سەردەمی ترامپ ناکۆکییەکان شێوازی تری وەرگرت، کاردانەوە و ناکۆکی دیکە سەری هەڵدا، سزا و هەڕەشە هاتە مەیدان، ئەو سیاسەتە نێودەوڵەتییەی ترامپ کاری پێدەکات (لەگەڵ تورکیاش) جیاکاری خۆی هەیە، بۆ تیگەیشتنی ورد و ڕوونبوونەوە زیاتر پێویستی بە هەڵوەستە هەیە، هەڵوێستە لەسەر سیما بنچینەییەکانی سیاسەتی ترامپ، بۆ ئەمەش دەچینە بەشی دووەم .



# بەشی دووەم

## تەوەری یەکەم

## سیاسەتی نوێی ئەمریکا
## (بنەمای ترامپیزم - Trumpism)

هەرچەندە واباوە کە (ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا) دامەزراوەییە و بە گۆڕینی سەرۆک کاریگەریەکی زۆری نابێت، بەڵام دەبینین هەر سەرۆکێک بەرنامە و شێوازی کاری جیاوازتری هەبووە، بۆیە بنەماکانی (مۆنرۆ) جیایە لەگەڵ بنەمای (ویلسۆن)، هەردووکیان جیاوازن لەگەڵ (ئایزنهاوەر و ترومان)، ئەوانەش جیاوازن لەگەڵ بنەماکانی (فۆرد و نیکسۆن و تادەگاتە بۆش)، لە هەمووان جیاوازتر نێوان ترامپ و ئۆبامایە، بەشێک لە پسپۆڕان ئەو جیاوازیانە دەگێڕنەوە بۆ جیاوازی بەرنامەی کۆماری و دیموکراسەکان، بەڵام لەکۆتاییدا هەر سەرۆکە و ڕێرەوێکی نێودەوڵەتی جیاوازی هەیە، جیاکەرەوەی هەرە بنچینەیی ترامپ بریتیە: لەسێگۆشەی (ئابوری - ئەمریکا - ملکەچی بەرامبەر بەخۆشی)، هەرە گرنگەکەی ئەوەی دواییە کە دەیەوێت بەبێ بەکارهێنانی هێز ئامانجەکان بهێنێتە دی.

## کەسایەتی ترەمپ رەنگدانەوەی بەسەر ململانییەکان

دۆنالد ترامپ، هەر لە سەرەتایی دەرکەوتنی لە بانگەشەی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ئەمریکا لە ساڵی ٢٠١٦ وەک کەسایەتییەکی ئابوری و بزنسمان دەرکەوت، بانگەشەی کۆنی (Make America Great Again) بوو، ئەم بنەمایەش زیاتر بنەمایەکی ئابوورییە، ترامپ خۆیی وا پیشاندا کە هەموو بڕیارێک و ستراتیژییەتی خۆی لە ماوەی سەرۆکایەتی ئەمریکا لە چوارچێوەی بنەما و پرەنسیپە ئابورییەکان دێنێتە دی، لەو پێناوەش چی پێویست بێت دەیکات. لەم بارەیەوە (راین شیرمان) ئاماژە بەوە دەکات، کەسایەتی ترامپ کەسایەتییەکی بەرەنگارییە، هیچ کات شەرم لە هیچ بەرنگارییەک ناکات بەرامبەر هەر دەوڵەت و هێزێک بێت، بۆ نموونە/ کشانەوەی ئەمریکا لە رێککەوتنامەی پاریس تایبەت بە (کەش و هەوا) ساڵی ٢٠١٥، هەروەها دەتوانین بڵێین ترامپ خاوەنی کەسایەتییەکی (زاڵ) و لە هەمانکاتدا (فەوزە)ویشە، بەتایبەت گەر بەراوردی بکەین بە (باراک ئۆباما)ی سەرۆک پێشوو، ئەوەی ئۆباما لە ماوەی سەرۆکایەتییەکەی کردی، لەو سیاسەتە دیبلۆماسیەیی گرتییە بەر لە بەرانبەر وڵاتان، رێککەوتنی لەگەڵ ئێران و ئاساییکردنەوەی پەیوەندیەکانی لەگەڵ کوبایی دراوسێی، بەڵام ترامپ لە هەوڵی هەڵوەشاندنەوەی کۆیی ئەم هەوڵە دیبلۆماسیانەی ئۆبامایە.

## ملکەچپێکردن بێ بەکاهێنانی هێز

هەموو ئەو هەنگاوانەی سەرەوە باسکرا لەچوارچێوەی بنەمایەکە، کە پێی دەگووترێ (ارغام دون استخدام القوة) یان (قدرة على الارغام) بناغەکەی لە نەزەرێکەی (نیکسون) دێت (النصر بلا حرب)، ئەوەی ترامپ ناوی (ملکەچپێکردن بێ بەکارهێنانی هێزە)، کە خەریکە دەبێتە توخمێکی گرنگی سیاسەتی نێودەوڵەتی و تیایدا دیزاینێکی نوێی پەیوەندی نێودەوڵەتی بەرهەم دەهێنێت، لەبەر گرنگی ئەو تیۆرە تازەیەی نێودەوڵەتی، هەڵوەستەیەکی لەسەر دەکەین:

توانای ملکەچککردن بەرامبەر بێبەکارهێنانی هێز، هەر ئەوە ناونیشانی توێژینەوەکەی دامەزراوەی ڕاندە، راڤەکەی: (ملکەچپێکردن بێ بەکارهێنانی هێز) کە خەریکە دەبێتە چەکی دەستی ترامپ، یەکەمجار دامەزراوەی (راند RAND)ی ئەمریکی لە ساڵی ٢٠١٦ توێژینەوەیەکی ئامادەکردووە بۆ وەزارەتی بەرگری ئەمریکی "پنتاگۆن" بەناونیشانی (القدرة على الارغام مواجهة الاعداء بدون حرب) واتە توانای ملکەچکردن و بەرەنگاربوونەوەی دوژمنان بەبێ جەنگ. ئەم توێژینەوەیە بەشێکە لە پرۆژەیەکی گەورەی پنتاگۆن بەناونیشانی (ئاسایشی پتەو - الأمن الصلب) لەم توێژینەوەیەدا جۆر و قۆناغەکانی بەرگری و جەنگی ئەمریکا ریزبەندکردووە بەهەڵسەنگاندنەوە ، بۆی دەرکەوتووە (القدرة على الارغام) هەم ئامانجەکان بەخێرایی دەهێنێتە دی و هەم کەم تێچووە، هەروەها جۆر و قۆناغەکانی بەرەنگاربوونەوەکانی ئەمریکا ریزبەند کردووە، بۆیان دەرکەوتووە (تیۆری ئیرغام) لەهەموی باشترە، بەم چوار شێوازانەی خوارەوە:

**یەکەم/ هێزی رەق (Hard Power):** واتە بەکارهێنانی راستەوخۆی چەک بۆ یەکلایکردنەوەی ململانێ سیاسی و ئابوری و سەربازی و ئەمنییەکانی ئەمریکا. ئەم هێزە بەرهەمدارە و ریسک و خەرجیەکانی زیاترە و توندوتیژە بۆیە کەمتر بەکاردەهێنرێ.

**دووەم/ هێزی نەرم (Soft power):** واتە بەکارهێنانی ماندەری ئابوری، گرێبەستی سەربازی و هاوکاری دارایی و لۆجستی و ئەزمون بەو وڵات و لایەنانەی کە ئەمریکا بەنیازە هەڵسوکەوتە لارێیەکانیان بگۆڕێت. ئەم هێزە ریسک و خەرجی کەمە، بەڵام بەرهەمێکی وای نییە، ناتوندوتیژە و لە هەر کاتێکدا بەکار دەهێنرێت و ئامانجەکانی ورد نیە.

چەند راپرسییەکیش زیاتر هانی ئەو بنەمایە دەدەن ،لەوانە 82%ی خەڵکی ئەمریکا پێی هەڵەیە سوپای ئەمریکا چووەتە ئەفغانستان، 69% پێیان هەڵەیە چووەتە عیراق

،68%یش پییان هەڵەیە چووەتە سوریا...، ڕای گشتیش لە ئەمریکا حیسابی جدی بۆ دەکری .

**سێیەم/ توانای ملکەچکردن (بنەمای ترامپ):** واتە بەکارهێنانی فشاری ئابوری، و سەربازی و سیاسی و تەکنۆلۆژی لەلایەن ئەمریکاوە بۆ گۆڕینی هەڵسوکەوتە لاڕێیەکانی ووڵات و لایەنەکان. هەروەها پرۆسە هەواڵگرییە نهێنییەکان و پرۆپاگەندە و یارمەتیدانی ئۆپۆزسیۆنی سیاسیش دەگرێتەوە. ئەم هێزە بەرهەمێکی باشی دەبێت، ریسک و خەرجی کەمترە، ناتوندوتیژەو لەهەر کاتێکدا دەتوانێت بەکاریبهێنی و ئامانجەکانی وردە.

لەبەر ئەوەی لە ڕابردوو ئەمریکا "هێزی رەق"ی لەهەندێک وڵاتی وەکو ڤێتنام و سۆمال و لبنان و عێراق بەکارهێناوە و سەرکەوتوو نەبووە، ئەگەر سەرکەوتووش بێت کاولکاری گەورەی لێ دروست بووە، بە تایبەتی ئەگەر ڕووبەرووبونەوەکان لەگەڵ هەندێک وڵاتی وەکو روسیا و ئێران بێت. ئەمە جگە لە گەورەیی خەرجی ئەم جۆرە هێزە، ئەوا ئەمریکا لەهەوڵدایە خۆی دوربخاتەوە لە بەکارهێنانی. هەرچەندە هێزی نەرمیش کاتێکی زۆری دەوێت و ئامانجەکەشی زۆر ورد نییە لە پێکان.

**چوارەم/ (هێزی زیرەك smart pawer):** وەك سەرەتایەك بۆ توخمێکی کاریگەر لە سیاسەتی نێودەوڵەتی (ملکەچپێکردن بە بێ هێز)، ئێستا ووڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا شێوازی توانای ملکەچکردن زیاتر بەکاردەهێنێت.

ئەوەی پەیوەندیدارە بە کورد راستەوخۆ ناوی نەهاتووە، بەڵام بەشێك تەرخان کراوە لە ئامرازەکانی هێنانەدی ئەو ئامانجانە لە ڕێی (خصوم) و ئۆپۆزیسۆن و نەیارانی ئەو دەسەڵاتەی ئەمریکا دەیەوێ ملکەچ و ئیرغامی بکات.

**سەرچاوەکانی (توانای ملکەچکردنی ئەمریکا )دەگەڕێتەوە بۆ:**

١- ئەمریکا خاوەنی ٣٠% وەبەرهێنانی راستەوخۆی بێگانەیە. بەمەش بەپلەی یەکی بێ ڕکابەر دێت لە جیهاندا.

٢- دراوی دۆلاری ئەمریکی بۆتە بناغەی ئاڵوگۆری بازاڕە جیهانی و بانکیەکان.

٣- حەوت کۆمپانیا ڕاگەیاندنە گەورەکانی جیهان و ٩٥% ی دەستکەوتی ریکلامی دەگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا.

٤- ئەمریکا فرۆشیاری سێ چارەگی چەکی جیهانییە و هاوکاری سەربازی ساڵانەشی بە (١٨) بلێۆن دۆلار مەزەندە دەکرێ. بەمەش بە پێش گشت ووڵاتانی جیهان دەکەوێ.

٥- ئەمریکا سەرۆکایەتی یان بەشداری سەرۆکایەتی گەورەترین دامەزراوە ئابورییەکانی جیهانە.

٦- هێزە دەریایەکانی ئەمریکا زۆر لە پێش وڵاتانی ترە بەجۆرێک دەتوانێت ئابڵوقەی زۆربەی دەریاکانی جیهان بدات.

٧- زانیارییە هەواڵگریەکانی ئەمریکا لە جیهان زۆر فراوانە بەجۆرێک دەتوانێت بەشداربێت لە بڕیاری سیاسی وڵاتان.

8- بەکارهێنانی ئۆپۆزیسۆن و ناحەزەکانی ئەو وڵاتانەی بەر (ئیرغام) دەکەون.

کۆتا خاڵیش ئەمریکا ئیستا تاکە جەمسەری جیهانە، ڕاستە هەندێ وڵات هەیە لەدەرەوەی خولگەی ئەمریکی، بەڵام کاریگەرییەکانیان سەرتاسەری نییە، ئێران لەسەر ئاستی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست جەمسەری بەرامبەر ئەمریکایە، چین لەسەر ئاستی ئاسیای رۆژهەلات-یان وەك بریجنسکی لەکتێبی (رقعة الشطرنج الكبري السيطرة الامريكية و مايترتب عليها جيواستراتيجيا) چین دەوڵەتێکی ئیقلیمیە و تەواو، روسیا لەسەر ئاستی ئاسیا.

**شێوازەکانی تو انای ملکەچکردنی ئەمریکا بۆ وڵاتان بریتین لە:**

- سزا ئابورییەکان.
- قەدەغەکردنی فرۆشتنی چەک و تەکنەلۆژیا.
- بەکارهێنانی سەرچاوەکانی ووزەی وەک نەوت و گاز.
- گەمارۆیی دەریایی.
- پشتگیریکردنی نەیارە سیاسیەکانی دەوڵەت.
- هێرشە ئەلیکترۆنییەکان.

توانای ملکەچی ئەمریکا زۆر بەهێزتر دەبێت، ئەگەر هاتوو وڵاتە هاوپەیمانەکانی هاوکاری و بەشدارییەکی کاریگەری لەگەڵ بکەن، لەوەوە کارەکە ئاڵۆزە بۆ کورد، چونکە لە ئامرازێك کورد دەگرێتەوە، لە بەکارهێنانی (خصوم) لەلایەکی تریش هاوپەیمانان دەگرێتەوە کە لە ناوچەکە زیاتر مانای تورکیایە، دواتر باسی دەکەین.

هاوکات شێوازی توانای ملکەچکردنی ئەمریکا لەسەر ئێران زیاترە لەوەی لەسەر تورکیا، چونکە ڕووی دیموکراسی و مافی مرۆڤ و ئاسایشی نەتەوەیی ئێران قێزەونە لە لای هاوپەیمانەکانی ئەمریکا وەکو ووڵاتە رۆژئاوایی و کەنداوییە عەرببیەکان. ئەمە لەلایەک، لەلایەکی تریش وڵاتی تورکیا ئەندامی هاوپەیمانی ناتۆیە لەگەڵ وڵاتە رۆژئاواییەکان و کرانەوەیەکی بەرچاوی کولتوری و ئابوری و سیاسی هەیە، سەرەڕای ئەوەش چەندین هۆکار وای کرد سزاکان لەسەر تورکیاش کاریگەر بێت، باشترین نیشانەی کاریگەری ئەوەیە لیرەی تورکی زۆر دابەزی، وەک لە (ئەلمۆنیتەر) دابەزینی لیرەی تورکی بەڕێژەی ٤٠٪ لەسەرەتای ئەم ساڵەوە بۆ کۆمەڵێک هۆکار دەگێڕێتەوە لەوانەش:

١- زیادبوونی قەرزەکانی سەر تورکیا و فراونبوونی کورتهێنان لەو ووڵاتە.

٢- کەمبوونەوەی متمانەی وەبەرهێنەرانی بیانی بە بازاڕەکانی تورکیا.

٣- بوونی کێشە لەنێوان تورکیا و ئەندامانی ناتۆ.

٤- بوونی کێشەی سیاسی لە نێوان ئەمریکا و تورکیا.

٥- دەستگیرکردنی قەشە برونسەن لەلایەن تورکیا.

٦- زیادکردنی تاریفی گومرگی لەسەر ئەلەمنیۆم و شیشی تورکی.

٧- هەڕەشەی (دۆنالد ترامپ) لە دانانی باجی زیاتر لەسەر توکیا کە هەموو ئەمانە بونەتە هۆکاری دابەزینی بەهای لیرەی تورکی بەرامبەر دۆلاری ئەمریکی و کاریگەری بنەماکەی ترامپ ( ارغام دون الحرب) .





تەوەری دووەم

# کاریگەرییەکانی
# (ناکۆکییەکانی ئەمریکا لەگەڵ تورکیا و ئێران)
# لەسەر کورد

بۆ دۆزینەوەی کاریگەرییەکانی ئەو ململانێیانە بەسەر دۆزی کورد، زۆر بەخێرایی باسی سروشتی پەیوەندییەکانی نێوان (کورد و ئێران) و (کورد و تورکیا) و (کورد و ئەمریکا) هەرە دواییەکەش باری ناوخۆیی کوردستان و چۆنێتی تێگەیشتنی سەرکردایەتی کورد لەو پەیوەندیانە و ئەو گۆڕانکارییە نوێیانە دەکەین، ئینجا باسی ئەو کاریگەریانە دەکەین بە هەردوو ئاڕاستەی ئەرێنی و نەرێنی، ناکرێت ئەو پرسانە لە باری زاتی کوردستان جیا بکەینەوە:

## یەکەم/ کورد و ئـێرانی نوێ

بەگشتی لەدوای مەینەتی کورد (لەسەرەتای سەدەی بیستەم) توشی وفاقی ئیقلیمی بوو وەک فاکتەرێکی مەترسیدار لەسەر کورد، جاریش وابووە ڕێککەوتنی ئیقلیمی و جیهانی ئاشکرا هەبووە لە دژی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد، هەر لەپەیماننامەی سەعد ئابادی ١٩٣٧، جەزائیر ١٩٧٥، هەروەها لە ساڵی ١٩٨٣ تورکیا و عێراق ڕێککەوتن هەریەکە بۆی هەبێت ٢٠کم بچێتە ناو خاکی یەکتر، هەر شۆرشێکی کورد

(بەتایبەتی لەباشووری کوردستان) سەری هەڵدەدا تا سەقفێک گەشەی دەکرد و بەهۆی (وفاق اقلیمی) و ڕێککەوتنێک کۆتایی پێدەهات، لەبەر هۆیەکی زۆر سادە، چونکە بەرژەوەندی وڵاتانی ئیقلیمی بۆ مانەوەی کوردستان لەژێر دەستیان باڵاتر بوو لەهەر کێشەیەکی تری ناوخۆیی، بەم شێوەیە ئەزموونی شۆرشەکانی کورد لە (١٩٢٥تا ١٩٧٩) بەو ئەزمونە تێدەپەڕێت، لەهەموویان ڕوونتر ڕێککەوتنامەی جەزائیری ساڵی ١٩٧٥ بوو، بۆ یەکەمجار لە مێژووی مەینەتی کورد دەوڵەتێک دروست بوو (لە ئێران لەساڵی ١٩٧٩) ناکۆکییەکانی لەگەڵ وڵاتانی ئیقلیمی و جیهانی بەهێزتر بێت لە هاوتەبایی لەسەر حسابی کورد، دوایش ئیسلامیەکان لە تورکیا (٢٠٠٦) و عێراق (٢٠٠٥) ئەو ویفاقی ئیقلیمیە و سێ کوچکە خنکێنەرەی سەر کوردیان دوور خستەوە و زۆر تەباش نەبوون لەگەڵ بنەماکانی سایکس پیکۆ و سیستەمی نێودەوڵەتی، تەنانەت هەندێ نەخشەی کۆمەڵایەتیشی گۆڕا کە لە (سایکس پیکۆ) دروست بوون لە ژێر سایەی (ڕابوونی نەتەوەیی)، بۆ نمونە عێراق، ئەو وڵاتە وا دروست ببوو کە تێیدا ٧٤% عەرەب و ٢٢% کورد و ئەویتریش کەمایەتی، لەو نەخشەیە ( سوننەی عەرەب-ناسیۆنالیزم) کە ڕێژەیان لە دەوروبەری ٢٢% خۆیان شاردبووەوە لەنێو دوو هاوکێشەی ڕەگەزی و تایفی، کاتێ ڕەگەزی بوایە ئەوا وەک عەرەب زۆرایەتی بوون بەرامبەر کورد، کاتێ تایفی و مەزهەبیش بوایە لەگەڵ کورد زۆرایەتی پێشان دەدرا بەرامبەر شیعە. لە هەردوو باریشدا بە سەرۆکایەتی سوننەی عەرەب (بەرگی عروبی) تەواو دەبوو، زۆربەی جیهانیش بەرژەوەندیەکانی بەو نەخشەیە بەند کرابوو، ببووە کۆنکرێتی و جوڵەی لە ژێر نەمابوو، کورد لەو نەخشەیە خنکابوو، تا هاتنی ئیسلامییەکان بە جێگرتنەوەی (ڕابوونی ئیسلامی) لە جێگەی ڕابوونی نەتەوەیی، دیزاین و نەخشەیەکی کۆمەڵایەتی نوێ و ئەکتیڤی عێراق بەو جۆرە داڕشتەوە، لە 24% سوننەی عەرەبی دەسەڵاتدار لە 55% شیعە، لە 22% کورد باقیەکەی تر کەمایەتیەکان، هەر لەوەوەیە تائێستاش دەستکەوت بۆ کورد دێتە دی، دەرکەوت کورد کێشە نیە بەڵکو عێراق خۆی

کێشەیە. بەو شێوەیە دەرگا داخراوەکانی سەر کوردی کردەوە، بۆیە تەواوی سەرکردە کوردەکان خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی، لەهەمووان زیاتر (مەلا مستەفا) بروسکەیەکی لە ١٩٧٩/٢/١١ بۆ خومەینی نارد بە (اكبر انتصار للشعب الكردی المضطهد...) وەسفی کردو مام جەلالیش هەموو هێزەکانی (ی.ن.ک)ی خستە ژێر فەرمانی خومەینی. ئەوە نەبوو هەر کورد سوودمەند بێت بەڵکو ئامانجەکانی شۆڕشی ئێرانی و بنەمای (تصدیر الثورة) لە کورد سودمەند دەبوو لە ڕووی ستراتیژی، کەچی سەرکردایەتی (ئێرانی نوێ) وەک پێویست هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کورد و خواستەکانیان نەبوو، لەلای سەرکردایەتی کوردیش نەیتوانی وەک پێویست سود لەو کاریگەریە زۆرە ببینێ، دیسان ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەژا بەهۆی هاتنی ئیسلامیەکان، بواری باش هەبوو بۆ کورد، بەڵام زۆربەی حزبە کوردستانیەکان دژی وەستانەوە، تەنها (پ.د.ک) لەگەڵی مایەوە، ئەو کاتیش پارتی ئەوەندە ئەکتیڤ نەبوو لە بزوتنەوەی کورد. دەتوانین بڵێین دەرفەتەکە ڕەت بوو، هەروەک کورد باش سودی لە ڕابوونی چەپ نەبینی.

لەوەش مونەزیرانی کورد دوو بۆچوونیان هەیە، بەشێک دەڵێن، هەتا ئەم ساتەش هەموو ئەو دەستکەوتانەی بۆ گەلی کورد (لە سەدەی ٢١) هاتۆتە دی بناغەکەی بۆ ئەو هەژانەی (ڕابوونی ئیسلامی) دەگەڕێتەوە، بەشێکی تر زۆربەی بۆ ئەمریکا دەگێڕنەوە، لە ڕاستیشدا هەریەک سەرچاوەی هەیە، ئەمریکاش ئەو هەڵوێستە نوێیانەی لەکاردانەوەی ئێران و هاتنی ئیسلامیەکانی تورکیا و عێراقە، بۆیە ئەو دەسکەوتانەی کورد لەیەک سەرچاوە نەهاتووە، بۆ پاراستنی ئەو دەستکەتانەش پێویستی بە عەقڵی زۆر وورد هەیە بتوانێت بیان پارێزێت و گەشەی پێبدا و بەهاوسەنگی بیگەیەنێتە دوا قۆناغ.

## دووەم / کورد و تورکیای نوێ

هەرچەندە لە دروستکردنی (تورکیای نوێ) کورد بەشدار بووە لە پەرلەمانی تورکیا (بویج ماجلیس) لە مادەی (١)ی میساقی نەتەوەیی تورکیا ئەو مافە سەرەتایانەی بۆ کورد تێدایە، لە دەوروبەری ١٩٢٢/١/١٦پەرلەمانی تورکیا پڕۆژەیەکی (ئەتاتورک)ی گفتوگۆ کرد سەبارەت بە فیدراڵی بۆ کوردستان، پێکهاتبوو لە (١٨) مادە وەک لە بەڵگەنامەی بەریتانی [E ٦٥/٩٦/٣٥٥٣] هاتووە، بەڵام ئەتاتورک لە هەمووی پەشیمان بوویەوە. لە دەستووری تورکیا (ANA YASA) لە مادەکانی (٦٤ تا ٦٨) تەنها (نەتەوەی تورکی) تێدا تۆمارکرا، نکۆڵی لە بوونی کورد کرا، بەتایبەتی مادەی (٦٦)ی ئەنا یاسا (Türk vatandaşlığı) ئیتر بوارێک بۆ کورد نەما تا ئەو ساتەش، تەنها لەکۆنگرەی (٤)ی ١٩٧٠/١٠/٣١حزبی کاری تورکی بۆ یەکەمجار دانی بە بوونی کورد مێنا لە نێو تورکیا، بەڵام کاریگەری نەبوو، چونکە ئەو هەڵوێستەی بووە هۆی ئەوەی دادگای تورکیا لە١٩٧١/٣/٢٠ چالاکی یاسایی بوەستێنێ هەروەک حزبی رەفاهیش بە هەمان دەرد چوو، تا ڕادەیەک چەپەکان ویستیان دەرگای ئەو زیندانیە بکەنەوە، بارودۆخی کورد بەو شێوەیە مایەوە هەردەم تورکیا ڕۆڵی نەرێنی بووە، هەتا چاوی لەسەر پارچەکانی تری کوردستانیش بووە تا گەشە نەکەن، دوژمنی پلە یەکی کورد بووە لەهەر شوێنێکی جیهان تروسکایی هەبووبێ دژ بووە، تا دوو ڕووداوی ناوەکی ئەو بەستەڵەکەی شکاند، لەساڵی ١٩٨٣ کوردی باکور شۆڕشیان هەڵگیرساند، دووەم هاتنی ئیسلامییەکان، ئەم دوو ڕووداوە دەرگا داخراوەکانی کردەوە و تەکانێکی تری بە بزووتنەوەی کوردایەتی دا، تا گەیشتە ڕادەی دەرگای گفتوگۆ بکرێتەوە و کرانەوەیەکی باش لەسەردەمی حزبی (داد و گەشە) دەستی پێکرد، بەڵام دەبێت ئەوە بزانین کە ئەو قۆناغە جیایە لەگەڵ پێشوو تر، بەڵام جدی نیە، زیاتر سیاسەتی (ئیحتوا)یە نەک گفتوگۆی برایەتی و چارەسەری دادگەرانەی دۆزی کورد، بۆیە ئەو پەیوەندیەی بە کوردستانی باشور زیاتر تاکتیکی بووە بۆ ئەوەی لەدەست دەرنەچێت، لەهەمان کاتیش سەرکردایەتی کوردی باکور وەك پێویست بەپیل ئەو قۆناغە نوێیە نەهات.

## هاوکێشە ستراتیژییەکانی ئێران و تورکیا سەبارەت بە کورد

لەدوای توێژینەوەیەکی ورد و هەمەلایەن لە قووڵایی پرۆژەکانی (ئێرانی و تورکی) لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کوردستان بە تێکڕای لێکدانەوەی ستراتیژی پەیوەندی سێگۆشەی (کورد – تورک - ئێران) لەو ساتە لە ڕوانگەی بەرژەوەندی (ئەمنی قەومیان) ئەوەیە، ئێران دۆخی نەتەوەیی کوردی تاڕادەیەك قبوڵە و نەبێتە دۆخی مەزهەبی، هەرچی تورکیایە دۆخی مەزهەبی کوردی قبوڵە نەک نەتەوەیی، ئەوەش بە ئاڕاستەی جیا کاریگەریان لەسەر کورد دەبێت، چونکە زۆربەی وڵاتانی عەرەبی و تاڕادەیەک وڵاتانی ئیسلامیش بەو ئاڕاستەی تورکیان، بە لۆجیکیانە ئەو دوو هاوکێشە دیزاینێک لە پەیوەندی بەو شێوە ی خوارەوە دروست دەکات:

١- لای ئێران دۆخی نەتەوەیی قبوڵە بە سنوردار نەگاتە ئاستی بە دەوڵەت بوون و نەشگاتە ناوخۆی ئێران، ئەوەش وا دەکات بەگشتی حزبە نەتەوەییەکان زیاتر قبوڵن، لەناو ئەوانیش ئەو حزبانەی دلسۆزی تەواو نەبن بۆ پرسە نەتەوەییەکان و تاڕادەیەک گەندەڵیش بن چاکترە بۆ ئەوەی پارێزگاری لەو واقیعە قانونی و سیاسیەی هەرێمی کوردستان بکات، ئەم واقیعەی نە لەناو بچێ نەگەشەش بکا بۆ بەدەوڵەت بوون، وا پێدەچێ بۆ ئاسایشی نەتەوەیی ئێران ئەو هاوکێشە ئاڵۆزە دوو حیزبەی دەسەڵاتداری باشوری کوردستان زۆر گونجاو بن، لەسەر ئەو بنچینە دەستی لە کاروباری کوردستان وەرداوە، ئەو دوو حیزبە وا بمێننەوە کامیان لاواز بووبن یارمەتی داون، لەکاتی ریفراندۆمیش دژی وەستاو یارمەتی هێزەکانی عێراقی دا، لەلای سەرکردایەتی کورد دەتوانرێت کار لەگەڵ ئێران بکرێ بە دۆمەینێکی تایبەتی، ئاسۆیەک هەیە بۆ کاری کوردایەتی، سەرکردایەتی کورد دەبێت بزانێت چۆن ئەو دۆمەینە دیاری دەکات، ئێران خۆی سەنتەری پرۆژەیە دریژکراوەی نێودەوڵەتی نییە، واتە لەگەڵ نێودەوڵەتی ئەو تەباییەی نیە، لێرە دەرفەتەکەیە، ئینجا (سەرکردایەتی کورد) چۆن ئەو هاوسەنگیە ستاندەرە دەدۆزیتەوە و پەیوەندی خۆی و ئێران و پەیوەندی کورد ئەمریکا و رۆژئاوا دەپارێزێت بەگەشەکردنەوە، نابێت بکەوێتە هەمان

پەیوەندی حزبێکی شیعە و ئێران، سروشتی پەیوەندی کورد (بەتایبەتی باشور) زۆر جیایە لەگەڵ پەیوەندی نێوان کۆمەڵگەی شیعەی عێراق و لبنان و بەحرەین و ئێران.

٢- لای تورکیا بە قبوڵنەبوونی دۆخی نەتەوەیی و نیشتمانی وادەکات تورکیا هیچ جۆرە قەوارەیەکی کوردی قبوڵ نەبێت، مەگەر بەتاکتیکی (یان بە مەبەستی ئیحتوا)، ئەو وەک جارانی ململانێی عوسمانی و سەفەوی دەیەوێ کورد بگەڕێتەوە ئەو پێگە مەزهەبیەی و دۆخی سوارەی حمیدی، ئەوەش ناکرێت و گەشەشی تێدا نییە، لە دوای شکاندنی پەیامەکەی شێخ سەعیدی پیران (١٩٢٥) کە لە شۆرشەکەی داوای کرد (یان گەڕانەوەی خەلافەت یان بۆ کوردستانیش دەوڵەت)، رەنگە تورکیا تاقانە بێت لەو جیهانە کە لە ناخی ستراتیژیەتیدا دژایەتی سەرهەڵدانی کورد بکات لەهەر چوار پارچە و لەهەمو گۆشەیەکی جیهان، واشی کردووە، هێزی سەربازی ناردۆتە سێ پارچەی کوردستان و شەڕیان دەکات، کەچی دەشبینرێ پەیوەندیەکی بە باشوری کوردستان کردۆتەوە، بەکورتی چۆنیەتی سروشتی ئەو پەیوەندییە لە ستراتیژیەتی تورکیا روندەکەینەوە:

پانتایی سنوری تورکیا لەگەڵ باشوری کوردستان (٣٣٠کم) کە بە هێڵی (برۆکسل-ئیڤیک) ناوزەد کراوە، ناوجەرگەی کوردستانی دوو لەت کردووە، تورکیا زۆر هەستیارە جیا لە دەوڵەتانی تری داگیرکەر تا ئەو ساتەش دەستوریانە ئینکاری بوونی کورد و کوردستان دەکات (بڕوانە مادەی ٦٦ی ئەنایاسا)، لە دیبلۆماسیەکانی ئەمریکا ئێستا ئاشکرا دەبێت کە تورکیا داوای کردووە (کیانی شمال العراق)ی ئێستا نەمێنێت، چەند جار لەگەڵ عێراق و ئێران ئەو گەلاڵەی تاوتوێ کردووە، هەوڵیداوە ئەو رێککەوتنانەی (سەدەی بیستەم) پیادە بکاتەوە، لە دوای ریفراندۆم پرۆژەی (ئۆڤاکۆ)ی هێنا ئارایەوە، تورکیا دەست خۆشیەکی زۆری لە حەشدی شەعبی کرد بۆ گرتنەوی کەرکوک، ریفراندۆم و مسعود بارزانی بە(خائین)ناوزەد کرد[1]، مانای

(1) سەرچاوە BBc عربی نیوز، 2017/9/26.

(ئیحتوا) کە لەسەروو هاتوە مانایەکی نێودەوڵەتی زۆر تایبەتی هەیە لە پەیوەندی تورکیا و باشوری کوردستان، تورکیا ئیحتوایەکەی بەچەند ئاراستەیەکە:

1. دەیەوێت ئەو ئاستە بەرزەی باشوری کوردستان وەری گرتووە لە نێودەوڵەتی و ئیقلیمی و عێراقی بەرەبەرە نزمی بکاتەوە.
2. دەیەوێت هەڵویستی مەزهەبی وەرگرێت و نەتەوایەتی و نیشتمانیەکەی رەتبکاتەوە و ئیتر هاوشێوەی سوارەی حەمیدی لێدروست بکات، هەروەک چەند جارێک ئەو کارەی بە باشوری کوردستان کرد، یەکەم هاریکاری ئاشکرا هێرشە هاوبەشەکەی پارتی و یەکێتی بەهاریکاری تورکیا دژی (پ.ک.ک) لە ساڵی ١٩٩٢ئەنجامدرا. ئینجا (پ.د.ک) چەند جاریتر بۆ تورکیای کردو یەکێتیش بۆ ئێران .
3. تورکیا دەیەوێت لەهەمان کات چاوچنۆکیشی هەیە بۆ ئەو داهات و نەوتەی لە کوردستان، تورکیا ساڵانە چوار ملیار و نیو قازانجی لەکوردستان کردووە[2].
4. تورکیا دەیەوێت کوردستانیش بکاتە بازاڕی تورکیا، لەبەرامبەردا سەرکردایەتی کورد پرۆژەیەکی وای نەبوو جگە لە خۆ گەندەڵکردن.

**لەبەر گرنگی خاڵی یەکەم، هەڵوەستەیەکی لەسەردەکەین:**

ئاستی بەرزی پەیوەندی نێودەوڵەتی چوار پلەی سەرەکی هەیە، پلەی هەرە خوارەوەی پەیوەندی مرۆییە، سەرووتری پەیوەندی سیاسیە، ئینجا یاسایی دێت، لەسەرووی هەمووشی سەربازی دێت، کەچی باشوری کوردستان لەگەڵ جیهان گەیشتە هەر چوار پلە و زۆر بەرزبوویەوە، گەیشتە ئەو ڕادەیە راستەوخۆ رۆژئاوا و نەتەوە یەکگرتوەکان مامەڵەی لەگەڵ بکەن، جاران رۆژئاوا و نەتەوە یەکگرتوەکان لەڕێگای دەوڵەتەکانی ناوچەکە تەعامولیان لەگەڵ کورد دەکرد، ئەو دەوڵەتانەش دیارن

(2) مؤسسة الراند: العلاقات التركيه الايرانيه بات متغيرا، 2013 ص 12.

چەندە دژی کوردن، لەسەدەی ٢١ راستەوخۆ (دون وسیط) هاتە کایەوە، لێرەدا تورکیا ویستی ئیحتوای ئەو پەیوەندیە بکات، جارێکیتر بە جیهان بڵێت ئێوە راستەوخۆ تەعامول لەگەڵ کورد مەکەن (کە دەوڵەتیان نییە، ئەندام نین لە نەتەوە یەککگرتوەکان)، وەرن لە ڕێگای ئێمەوە تەعامول بکەن، تورکیا دەیویست دیسان کورد بگەڕێنێتەوە پەیوەندیەکانی سەدەی بیستەم، سەرکردایەتی کورد بە وردی شارەزای ئەو سیاسەتەی ئیحتوای تورکیا نەبوو، خراپ تێکەوت، هەم لە (گۆڕینەوەی پشتیوانی نێودەوڵەتی بە پشتیوانی هەرێمایەتی)، هەم لە ریفراندۆمەکەش، خەریک بوو تورکیا لەو دواییەی سەرکەوتوو بێت لەو ئیحتوایە، بەڵام ئەو تێکچوونەی پەیوەندی ئەمریکا و تورکیا جارێکی تر باشوری کوردستانی رزگار کردەوە، بەو مەرجەی سەرکردایەتی کورد لەو سیاسەتە ئاڵۆزە گەیشتبێت و جارێکیتر نەکەوێتەوە داوی وڵاتانی هەرێمایەتی، (کە کرۆکی توێژینەوەکەیە). بۆیە تەنها خۆماندووکردنە بە پرۆژەی تورکیا بتوانی دەستکەوت بەدەستبهێنیت، هەروەک لێشی نەبینراوە.

## سێیەم/ کورد و ئەمریکای نوێ

پەیوەندی کورد و ئەمریکا بەچەند قۆناغێک تێدەپەڕێت، بەگشتی سیاسەی نێودەوڵەتی سەدەی بیست و جەنگی سارد زۆر جیاوازە، لەگەڵ سیاسەتی نێودەوڵەتی سەدەی ٢١ و تاک جەمسەری، لەسەدەی بیست رۆڵی موخابەرات زۆر گرنگ بوو لە رەسمی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتان و ئەمریکاش، زۆربەی موخابەراتەکان لە جەنگی سارد دروست بوونە، موخابەراتی ئەمریکی بە فەرمانی هاری ترۆمان لە ساڵی 1947 دەرچوو بەناوی (قانون امن الوطنی)، زۆر فراوان بوو، بودجەیەکی گەورەی هەبوو، دوای نەمانی (جەنگی سارد) بە یاسای بچوك کرایەوە بە پێی شەبەنگێك لە فەرمانی سەرۆکایەتی، EO 11905 in 1976, EO 12036 in 1978, (and EO 12333 in 1981)، ئەو کۆمەڵە فەرمانەی لە سەردەمی جەنگی سارد و

سەرۆکایەتی (ریگن) دەرچوو بۆ فراوانکردنی دەسەڵاتی موخابەرات هەموار دەکرێتەوە، بە تایبەتی لەسەردەمی بۆش بەو یاسایانە، لەدوای سەرهەڵدانی تیرۆر و 11ی سێپتێمبەر جارێکی تر کەمێك گرنگ بوویەوە، دیسان بودجەی (موخابەرات) هەڵسایەوە، بەتایبەتی لەساڵەکانی (2011 و 2012 و 2013)، بەگشتی ئێستا موخابەرات بەو پلە گەورەیە ڕۆڵی نەماوە (دامەزراوەکانی ثینک تانک) جێی گرتەوە، ئەوەش سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا و سیستەمی جیهانی جیا پێکدەهێنێ، بەتایبەتی بۆ کورد ناخۆش بوو لەچوارچێوەی موخابەرات ببیندرێت، تیڕوانینی ئەمریکی بۆ کورد لەچوارچێوەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو، تا ڕادەیەکیش موخابراتی بوو، پەیوەندییەکانی کورد و ئەمریکا لە باشترین دۆخیدا راستەوخۆ نەبوون، لە ڕێی دەوڵەتی سێیەم بوو، دەبوایە ئەو دەوڵەتانە بن کە دراوسێی کورد (یان داگیرکەرانی کوردستان)، عادەتەن ئەو دەوڵەتانەش ناحەزی کورد بوونە، زۆربەی جاریش کە کورد دەکەوێتە حیسابی ستراتیژی زۆر کاتی بووە، بەهۆی بنەمای (تضحية الجزء من اجل الكل) میللەتانی بێدەوڵەت و خەباتی رزگاری بە (جزء) و ڕووخانی سەرمایەداریش بە(کل) پۆلێن کراوە، ئەوە هەم لەلای یەکێتی سۆڤیەت هەم لای ئەمریکاش بەکار دەهات[3]، هەر بەو پێودانگە لینین پشتی (ئەتاتورک'ی) گرت لە دژی شۆرشەکانی کورد (١٩٢٠- ١٩٢٨) دوایش تێکدانی کۆماری مهاباد ١٩٤٦، هەروەها پشت گرتنی سۆڤیەت بۆ (بەعسی عێراق) لە ساڵی ١٩٧٢ و بەپێی مادەی (٨ و٩) (معاهدەی عێراق –سۆڤیەتی)، لەلای هەندێ ئیسلامیش وایە دەڵێت کە شەریعەت پەیڕەو کرا هەمووی چارەسەر دەبێت، بۆیە خەباتی خۆت سەرف مەکە بە (جزئيات) وەرە لەگەڵمبە بۆ(كليات)، ئەو جۆرە سیاسەتەی نێودەوڵەتییە بۆ کورد زۆر قورس بوو. لە سەدەی بیست و یەک پەیوەندی راستەوخۆ دروست بوو، کورد کەمێک لە ستراتیژییەت لەگەڵ ئەمریکا یەکی دەگرتەوە، بەڵام تا ئەو ساتەش وەک پێویست سەرکردایەتی کورد درکی پێ نەکردوە، کە ئەمریکا لەگەڵ داڕشتنی (سایکس

(3) لینین -المؤلفات الكاملة: "خلاصة المناقشة حول حق الأمم في تقرير مصيرها بنفسها"، ج19 ص261 – 262.

پیکۆ) بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست نەبووە، ئەوساش ئەمریکا داوای کرد ئەو ناوچانە بەپێی سایکس پیکۆ دابەش نەکرێت، بەڵکو بخرێتە سەر میلاکی کۆمەڵەی گەلان، لە جاڕنامە ١٤ خاڵەکەی ویلسن'یش ئەوەی لێدەخوێندرایەوە، لە ساڵی ١٩١٩ لیژنەی (کنگ -کراین'ی) بۆ ناوچەکە ناردو سیاسەتی (باب المفتوح)ی پەیرەو کرد، داوای کرد میراتی عوسمانی (بە کوردستان'یشەوە) بخرێتە سەر مومتەلەکاتی (عصبة الامم)، سیاسەتی ئەمریکا سەرکەوتوو نەبوو ئەو دیزاینە بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست خەملی، لەدوا ڕاپۆرتی لیژنەی (کنگ - کراین) داکۆکی لەو وڵاتانە کرد، کە تازە لەلایەن بەریتانیا و فەرنسا دروست کرابوون، لە ڕاپۆرتەکە ئاماژە بە یەکپارچەیی خاکی عێراق دەکات، لەو کاتەوە سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر یەکپارچەی خاکی عێراق نەگۆڕاوە تا ساتی ئامادەکردنی ئەم توێژینەوەش، هەر لەسەر ئەو بنچینەش پەیوەندیەکانی (ئەمریکا و کورد) لە باشترین دۆخی ئەوە بوە (کورد لە دۆزەخ دەردەهێنی بەڵام نایخاتە بەهەشت)، باشترین بەڵگە لە بڕیارێ دژە فڕینی سەرووی هێلی ٣٦ دێت نەک ٣٤ کەمافی تەواو بوو، هەر یەکەم پەیوەندی کورد و ئەمریکا لەو لیژنەیە (کنگ- کراین) بەدی دەکرێت، کە هاتبوون لە کوردستان لەگەڵ نوێنەرانی کورد دانیشتبوون، لەو کاتەوە تا نیوەی سەدەی بیستەم ڕۆڵێکی وای لە ناوچەکە نەبووە و لەگەڵ کوردیش بەو شێوەیە نەبووە، لەو کاتەوە دەتوانین بڵێین بووە میراتگری بەریتانیا (لە دوای جەنگی جیهانی دووەم) لەناوچەکە تا کۆتایی سەدەی بیستەم و رووخانی یەکێتی سۆڤیەت، (واتە لە نێوان جەنگی سارد) هەڵوێستی ئەمریکا (وەک لە بەڵگەنامە نهێنی و ئاشکراکان دەردەکەوێ) نەیویستووە خۆ لە کێشەی کورد بگلێنێت، ئەمریکا زیاتر بنەماکانی ئیستعماری و سایکس پیکۆی لە ناوچەکە پیادە کردووە، لەهەموو بەڵگەنامە و چالاکییە دیبلۆماسیە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆکان دەرکەوتووە، کە هەرگیز نەگەیشتە ئەو ڕادەیەی قەناعەتی ئەمریکا بێت، کە میللەتی کورد شایستەی مافی چارەنووسە، ئەو جۆرە سیاسەتە و تێنەگەیشتنی کورد لێی شکستی (١٩٧٥)ی لێ هاتە دی.

یەکەم گۆڕانکاری بەسەر سیاسەتی ئەمریکا سەبارەت بە کورد لە ساڵی ١٩٧٩ لە دوای شۆڕشی ئێران بە سەرۆکایەتی خومەینی دێت، تاڕادەیەک کورد کەوتە نێو حیساباتی ستراتیژی، جەنگی کەنداوی دووەم لە ساڵی ١٩٩١ و بڕیارەکانی دژ بە عێراق بەپاڵپشت بەبەندی (٧) قۆناغێکی نوێ لە ئاستی بەرزی پەیوەندی دەست پێدەکات، دوای ئەوەی ئیسلامیەکان لە تورکیاش سەرکەوتن و لە ساڵی ٢٠٠٣ نەبونە یارمەتیدەری هێزەکانی ئەمریکا لە کاتی هێرشیان بۆ سەر عێراق، لە ساڵی ٢٠٠٣ جارێکیتر تەکانێک بە پەیوەندی کورد و ئەمریکا درا بۆ ئاستێکی بەرز، لەگەڵ ڕووخانی بەعس لە عێراق و گەیشتنە دەسەڵاتی ئیسلامیەکان لە عێراق دووبارە تەکانێکی گەورەتر بەو پەیوەندیە درا، تا دەگاتە ریفراندۆم ئینجا دابەزیەوە.

داهاتووی ئەمریکا و کورد لە ژێر سایەی ترامپیزم و ناکۆکی لەگەڵ تورکیا دیسان دەرگاکان کرانەوە، ئەگەر عەقڵی زۆر وورد کوردستان بەڕێوە ببا، سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر کورد زۆر نەگۆڕاوە، بەڵکو سیاسەتی بەرامبەر سەرکردە کلاسیکیەکان گۆڕاوە بەتایبەتی لە دوای ریفراندۆم، وەك دامەزراوەی (برۆکنزینگی ئەمریکی) دەڵێت، پەیوەندییەکانی هەرێمی کوردستان و ئەمریکا گورزێکی کوشندەی بەرکەوت، پاڵپشتی عێراقی کرد لە هێرشەکانی بۆ سەر کەرکوك و شەنگال، بەڵام هەر برۆکنزینگ دەڵێت، ئەو هەنگاوەی ئەمریکا دیسان پێگەی ئێرانی بەهێزکرد، بەڵام دەیگێڕێنێتەوە بۆ عینادی سەرکردەکانی کورد، لەدوا بەیانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا جارێکی تر دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە ئەمریکا واز لە دۆستایەتی دیرینەی خۆی ناهێنێ لەگەڵ میلەتی کورد، تەنانەت رایگەیاندوە، کوردستانێکی بەهێزمان دەوێت لە عێراقیکی بەهێز، ئەوەش ڕوونە مانای وایە ئەو سزایانەی هەندێک حزب و سەرکردەی گرتەوە میللەتی کورد ناگرێتەوە.

سەبارەت بە دۆزی کورد، پێویستە مامەڵەکردن وەک نەشتەرگەری دڵ لەگەڵ پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکان بکرێت، کە ئەمریکا دەڵێت (کوردستانێکی بەهێز) مانای وا نیە وەزارەتی ناوخۆ و ئاسایش و زیندانی بەهێز بکەی، مەبەستی ئەوەیە دامودەزگا

بینا بکرێت، یاسا سەروەر بێت، سێ دەسەڵاتەکە لێک جیا بکرێتەوە، حزب چەکداری نەبێت، جێگۆڕکێ ی دەسەڵات و دیموکراسی بەرجەستە بێت، مافی مرۆڤ و ژن و رۆژنامەنوسی ئازاد هەبێت، شەفافیەت لە ئیدارە و دارایی هەبێت، دەست بە نەشونوماکردنی ئابووری و تەکنۆلۆجیا بکەیت.

بەکورتی زەمینەی سیاسەی نێودەوڵەتی لەسەدەی ٢١ بۆ پەیوەندی کورد و ئەمریکا لەو سەرچاوانە دێت:

١- لاوازبوونی رۆڵی موخابەرات لە رەسمکردنی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا و سەرهەڵدانی رۆڵی (ثینک تانکەکان - ناوەندە توێژینەوە ستراتیژیەکان)

٢- پەیوەندی نێوان کورد و ئەمریکا لە (وسیط)ەوە بۆ راستەوخۆ .

٣- نەبوونی ئەمریکا لەسایکس پیکۆ و دارشتنەوەی رۆژهەڵاتی ناوەراست .

٤- لەدەستدانی دۆستەکانی لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست یان بەدیوێکی تر تێکچوونی ویفاقی ئیقلیمی بەئاسۆیی و تێکچونیشی بە ستونی (واتە لەگەڵ ویفاقی نێودەوڵەتی).

کەواتە بەشێکی زۆر لەو پەیوەندییە بۆ کورد لە دۆڕاندنی دۆستی فەرمی ئەمریکا هاتووە لەناوچەکە، نزیکترین نمونە لەو بارەیەوە، ئەوە بوو پەرلەمانی تورکیا لە ١/٣/ ٢٠٠٣ رێگری کرد لە بەکارهێنانی بنکەی ئەنجەرلیک و خاکی وڵاتەکەی بۆ هێرشکردنە سەر عێراق، لەو کاتەدا زەرورییەتی کوردستان بۆ ئەمریکا دەردەکەوێت و، ئیتر لەوکاتەوە بناغەی پەیوەندییە راستەوخۆیەکانی ئەمریکا و کورد دروست دەبێت و، کورد سودمەندی سەرەکی بوو، بەپێچەوانەوە ئەگەر تورکیا رێگەی بدایە بە ئەمریکا، ئێستا کوردستان دەکەوتە ژێر هەژموونی تورکیا، واتە پەیوەندی کورد و ئەمریکا سروشتی نییە، لەو کاتانە سوودمەند دەبێ، کە دۆخی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ناسروشتییە، ستاندەربوونەوەی مەترسیدارە بۆ کورد، بونی ئەو هێزە ئیسلامیانە (لە تورکیا و عێراق و ئێران) بووەتە هۆی ئەو پەیوەندیە باشە و جەژنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد، پرسیارەکە ئەوەیە، ئاخۆ ئەگەر ویفاقێکی ئیقلیمی هاتە کایەوە بە ئاسۆیی لەهەمان کات بەستونیش ویفاقەکە لەگەڵ نێودەوڵەتی ڕێکبوون ئەوا

ئەوکاتەیە، کە تەواوی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد دەکەوێتەوە مەترسی. ئایا ئەو ئەگەرە چەندە نزیکە؟ چەندە ئەگەری هەیە تورکیا تەنازول بکات، هەروەک بۆ روسیا کردی. ئەوانە هەمو ئەگەرن بۆ دیراسەکردن، لە چوارچێوەی (بنەمای ئیرغام)ی ترامپیش هەردوو ئەگەر هەیە، وەك لە توێژینەوەکەی راند هاتووە، لە بەکارهێنانی (خصوم) کورد دەگرێتەوە، لە بەکارهێنانی (هاوپەیمانی) تورکیا دەگرێتەوە، لە یەکەمیان تارادەیەك تاکتیکیە و قازانجی کوردە، لەلای دووەمیان زیاتر ستراتیژییە و زەرەرێتی.





## تەوەری سێیەم

# دروستبونی هەڵویستی ئەمریکا بەرامبەر کوردستان تێپەڕبوونی بە ڕێگای تورکیا

لێرەدا تەنها باسی تورکیا دەکەین، چونکە ئێران پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا نییە، توێژینەوەکەشمان لەسەر تورکیا و ئێرانە. بەگشتی ئێستا سەرچاوەکانی دروست بوونی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکی بریتین لە:

١- ثینک تانکەکانی (راند، برۆکنیز، فۆرین ریلەیشن، مرکز الدراسات الاستراتیجیه والدولیه...).

٢- ئەنجومەنی ئاسایش.

٣- لیژنەی وەزارەتی دەرەوە لە کۆنگریس.

٤- سەرۆکایەتی کۆمار.

٥- وەزارەتی دەرەوە.

٦- موخابەرات، هەندێک جار وەزارەتی بەرگریش ڕۆڵی هەیە.

چەند لۆبییەکیش هەیە، کاریگەری خۆیان هەیە لەسەر وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، لە هەموان بەهێزتر لۆبی یەهودی، یەهود ڕێژەی 3%ی ئەمریکان کەچی 25%ی ڕاگەیاندنیان لەبەر دەستدایە، 15%ی پۆستەکان،17%ی ڕێکخراوەکان، ئەوەش وا دەگەیەنێت کە لەقەبارەی خۆیان چالاکترن، یەکەم لۆبیان لەساڵی 1954 بەناوی

(مجلس الشؤن العامة الصهيونى الامريكى) دروست کردووە، لەو کاتەوە رۆژ بە رۆژ کاریگەریان زیاد دەبێت.

بەگشتیی ئەوە گوزارشت لە بەرژەوەندی باڵای ئەو وڵاتە دەکات، ئەوە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکایە بەگشتی، ئینجا بۆ هەر ناوچەیەکیش چەندین فاکتەر و فلتەری تر کاریگەرن، پێیدا تێپەڕدەبێت، بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست (ئیسرائیل، تورکیا، سعودیە و....هتد) دەبنە فلتەر شان بەشانی ئەو وڵاتانەی کە دۆستی ئەوانن، ئەو هەڵوێستانەی ئەمریکا کە دەگاتە کوردستان دەکەوێتە ژێر چەندین کاریگەر، سەربارى پرۆژەکانی چاکسازی رۆژهەڵاتی ناوەراست (پرۆژەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گەورەی ئەمریکی لە ٢٠٠٤ - مبادرة الشراكة كۆلن پاول - ئەمریکا - ٢٠٠٢ - رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی تازە-ووتاری ج بۆشی کوڕ لە ٦/١١/ ٢٠٠٣)... هەموو ئەوانە کاریگەریان بەسەر سیاسەتی ئەمریکا هەیە، بەڵام لەکۆتاییدا بریتین لە (کاربەڕێکەری)ی سایکس پیکۆ، وەک ڕسای سیاسیش دەشێ مافێکی چارەنوس بۆ بەشێک لەکوردستان بێتەدی، بەڵام لەژێر دیزاینی (سایکس پیکۆ) هەرگیز تەواوی کوردستان بەتەواوی مافەکانی خۆی ناگات، بۆیە هەر پرۆژەیەک (چ عەلمانی، چ ئاینی) ئەگەر دەستکاری (سایکس پیکۆ) بێت لە خزمەتی ستراتیجی دۆزی کوردستانە، تا رادەیەکیش گەلالەکانیش ئەمریکا کاریگەری هەیە کە بریتین لە:

1. گەڵاڵەی بریجنسکی- لویس.
2. گەڵاڵەی (ئەلوف راین).
3. گەڵاڵەکەی فرانک جاکۆبسن.
4. گەڵاڵەکەی باراج خانا.
5. گەڵاڵەی رالف بیترز.

بەگشتی ئەو گەڵانانە باشن دەستکاری سایکس پیکۆی تێدایە، لێرەدا لایەنێک لە کاریگەرییەکانی (ناکۆکی تورکیا و ئەمریکا) بەسەر کورد ڕوون دەبێتەوە، ئەگەر هەڵوێست و بڕیارەکەی ئەمریکی لە ژێر سایەی (دۆستایەتی تورکیا و ئەمریکا) بێت، ئەوا بە فلتەری تورکیا ڕەت دەبێت و کاریگەریەکی نەرێنی زۆری لەگەڵ دێت، بەڵام

ئەگەر لە ژێر سایەی (ناکۆکی تورکیا و ئەمریکا) بێت ئەوا بەفلتەری تورکیا ناڕوات و ئیتر بە سەلامەتی و بە ئەرێنی دەگاتە کوردستان، کەواتە چەندین ڕێگە هەیە بۆ بڕیار و هەڵویستی ئەمریکا لە واشنتۆنەوە بۆ کوردستان، باشترین ڕێگە ئەوەیە لە واشنتنەوە بێت (بە گەڵاڵەکان ڕەت بن نەک پرۆژەکان)، ئینجا راستەوخۆ بێت نەک لەڕێی تورکیا و وڵاتانی تری دەوروبەر، دەبێت کورد خۆشی بزانێت چۆن کاریگەرییەکانی خۆی بەرجەستە بکات، نەبێتە مورتەزەقە و نە خۆشی گۆشەگیربکات.

# بەشی سێیەم

## تەوەری یەکەم

## تێنەگەیشتنی سەرکردایەتی کوردی باشور لە ستراتیژییەتی ئەمریکا

لە پەیوەندی نێودەوڵەتی کەمتر ڕێگە دراوە دەوڵەت و حزبی وڵاتێکی تر لە پەیوەندی دابن، دەبێت دەوڵەت بە دەوڵەت بێت، بەو شێوەیە ئەمریکا کەمتر لەگەڵ حزب مامەڵەی  هەیە، ئەو کارە زیاتر بە (CIA) سپێردراوە، بەتایبەتی حزبی چەکدار لای ئەمریکا لەلیستی تیرۆر (بۆ ناوەخۆیی) تۆمار دەکات، تا ساڵی 2013 هەردوو حزبی چەکداری کوردستانی (دەسەڵات) لەو لیستە بوون، تا نەتوانن سەردانی ئەمریکا بکەن، بەگشتی ئەمریکا لەگەڵ هەرێمی کوردستان مامەڵەی هەیە (بەدەر لە CIA)، بەڵام نەگەیشتۆتە ئاستی ڕێککەوتن و بەڵگەنامە و دیبلۆماسیەتی فەرمی، تەنها یەک بەڵگەنامە هەیە، بریتیە لە ڕێککەوتنە (٨) مادەکەی نێوان (پنتاگۆن و بەغدا و هەولێر)، ئەویش لە مادەی (٧) هاتووە کە ڕێککەوتنەکە کاتییە و ماوەی ساڵێک کۆتایی دێت. تێکنەگەیشتنێکی ترسناک بەدی دەکرێت لە نێوان سەرکردایەتی کورد و ئەمریکا، بووە هۆی لێکترازان و پەراوێزخستنی باشوری کوردستان، سەرکردایەتی کورد گوێ بە ناوەندی توێژینەوە و (ثینک تانک) نادات، (وەک ئەمریکا خۆی دەڵێت،

زۆر ماندوویان کردین)، لەوەوە بەڕوونی دەردەکەوێ هێشتا سەرکردایەتی کورد باش نازانێت کە :

١-پێگەی خۆی لە کوردستان و پێگەی کوردستان لە جیهان چەندە.

٢-نازانێت پاڵپشتی نێودەوڵەتی بۆ کوردستان لە پەیوەندییە ئیقلیمیەکان نایەت.

٣- نەیزانیوە ستراتیژی ئەمریکا لە ناوچەکە چیە و بەرەو کوێیە.

باشترین بەڵگە بۆ تێنەگەیشتنی سەرکردایەتی کورد لە پرسە نێودەوڵەتیەکان ئەوە بوو لە ماوەیەکی کەم گوتیان، "ئەمریکا دیسان پشتی لە کورد کرد و بێوەفا بوو" (کە وانیە)، پێش ریفراندۆمیش کە دەیان گوت ئەمریکا لایەنگری دەوڵەتی کوردستان و ریفراندۆمە ئەوەش (وانەبوو)، ئەم ڕوانگە چەوتە لە تێنەگەیشتنی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا بۆ ناوچەکە دێت. ئەو تێکنەگەیشتنە بووە هۆی جیاوازی و سزا، بەکورتی هەڵە و چەوتییە سەرەکییەکانی سەرکردایەتی کورد هەڵدەبژێرین لەم خاڵانە:

١- گۆڕینەوەی پەیوەندی (ستراتیژی لەگەڵ ئەمریکا) بە پەیوەندی (تاکتیکی تورکیا).

٢- ئەمریکا ڕای لەگەڵ ئابووری سەربەخۆ و ناردنی نەوت نەبووە و پێشبینی ئەوەی کردووە هەرێمی کوردستان دەکەوێتە قەیران و چاوچنۆکی تورکیا.

٣- ئەمریکا پێی باش نەبووە ئەو هەمو پەیوەندییە زیادەڕۆیەی سەرکردایەتی کورد لەگەڵ تورکیا کە هەیبووە، وای بەباش زانیوە پەیوەندیەکی نۆرماڵ بێت، بە ئەندازەیەکی زیاتریش پێی باش نەبووە ئەو پەیوەندیە زۆرەی هەرێم لەگەڵ ئێران .

٤- لەبارەی کوردستانی رۆژئاواش لە هەڵویستی (پ.د.ک) و تورکیا ڕازی نییە.

٥-لە تۆمارگای مافی مرۆڤ و رۆژنامەنوس و سەروەری یاسا و شەفافیەت ڕازی نەبووە.

٥- بەپێی ڕێککەوتنی نێوان (پنتاگۆن و هەولێر و بەغدای ٢٢/تموز/٢٠١٦) کە لەسەرەوەش باسکرا، پێکهاتووە لە (٨) مادە، لەمادەی (٦)ی ئەو رێککەوتنە (دەبێت هێزی پێشمەرگە بکشێتەوە)، کەچی مسعود بارزانی دەیگووت ناکشێینەوە، دوای لەناوچەکانی تریش کشایەوە.

٦- بۆ ئەمریکا سەرکەوتنی ئەزمونی عێراق زۆر گرنگە، بەتایبەتی ئارامی و سەقامگیریەکەی، بۆیەش لە پیناو ئەو سەقامگیریەی چاوپۆشی لە هەندێک پێشێلکاری دەکات، بەهەمان هاوکێشە سەقامگیری کوردستانیشی لا گرنگە، چاوپۆشی زۆر پێشێلکاریشی لە پێناو ئەو سەقامگیرییە کردووە لەلایەن هەردوو دەسەڵاتی بەغدا و هەولێر، بەڵام لەکۆتاییدا ئەگەر (ناسەقامگیری) هەرێمی کوردستان و بەغدا تێکگیرا لایەنگری سەقامگیری عێراق دەکات، یەکەمجار ئەوەش جیاوازیەکە بەڕێوەیە و ماناکەشی ڕوونە.
٧- ئەمریکا دەیەوێت هەرێمی کوردستان پاڵپشتی سەرۆك وەزیرانێکی نزیك لە خۆی بکات (وەک لە دوا ڕاپۆرتی برۆکنیز هاتبوو) .
٨- داوای کردووە باسی دەوڵەتی کوردستان نەکرێت، بەڵام ئیشی بۆ بکرێت، لەوەش پابەند نەبوون.
٨- دوا ناکۆکی ڕاستەوخۆ پرسی ریفراندۆم بوو، ئەمریکا زۆر ناڕازی بوو، پێیوایە کاتی نەهاتووە، پێشبینی و ئەنجامە خراپەکانی بەو سەرکردایەتیە گوتبوو، بەگوێی ئەوانیش نەکراو شکستە گەورەکان لێرەوە دەست پێدەکات.
سیاسەتی نێودەوڵەتی لە کات و ساتی ئێستا پێی چاک نییە دەستکاری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بکرێت (دەستکاری سنور)، ئەمەش بۆ ئەوەی هەر بۆشاییەک دروست بێت هێزی توندڕە و ئامادە دەبێت پڕی بکاتەوە، وا هەست دەکرێت هەڵویستی نێودەوڵەتی ئەوەیە کە حزبەکانی هەرێمی کوردستان مقەوەماتی پڕکردنەوەی بۆشایی رۆژهەڵاتی ناوەراستیان نییە، ڕەنگە ئەو مقەوماتە لە کوردانی رۆژئاوا ببینن.
ناکۆکیەکان گەیشتنە رادەی سزا و هەڕەشە، لەبەیاننامەکەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکای ٢٠١٧/١٠/٣٠ بە ڕوونی پێشوازی لە دەستلەکارکیشانەوەی مسعود بارزانی دەکات، پێخۆشحاڵبوونی گوزارشتە لەو ناکۆکی و ناڕازیانەی ئەمریکا بەرامبەر سەرکردایەتی ئێستای کورد .

## تەوەری دووەم

# ئاسۆی ناکۆکییەکانی

# (ئەمریکا و تورکیا و ئێران)؛ چارەنوسی کوردستان

کەواتە ئەو ناکۆکیەی ئەمریکا لەگەڵ تورکیا جاریکیتر دەرگاکان دەکەنەوە بە زۆر ئاراستە، واتە دیسان دەرفەت هاتەوە پێش، لە پیشووتریش دەرفەتی لەوەی گەورەتر هاتە پێش بەهۆی ئەوەی سەرکردایەتی کورد نەیتوانی وەک پێویست بیقۆزێتەوە سەرکەوتوو نەبووین، ئێستاش کوردستان لە دۆخێکی ئابووری و سیاسی و ئیداری زۆر خراپ دایە و توانای دابین کردنی پێداویستیە نێوخۆییەکانی نیە، خاوەنی زیاتر لە (٤٢٨٠٠٠) هێزی چەکدارە لە وڵاتانی وەك (ئەندۆنیسیا و فیلیپین و تایلاند و زۆر وڵاتی گەورەی جیهانی) زیاترە، ئەگەر پشتیوانی دۆستانی لەگەڵ نەبێت بەتایبەتیش ئەمریکا، توانای پاراستنی نیشتمانی نییە، نوقسانی هەرە گەورە یاسا سەروەر نییە، دەستور نییە، دامەزراوەکان لاواز کراوە، حزب چەکداری هەیە، جێگۆڕکێی دەسەڵات نیەە، گەندەڵییەکی ترسناک باڵی کێشاوە، کەسی شایستە لە شوێنی شایستە نیە[4]. ئەگەر ئەو بارە زاتیە ڕچاو نەکرێت و ئەو دەرفەتەش دەڕوات کە هەمانە، چونکە تەنازولی تورکیا ئەگەرێکی نزیکە، بەرپابوونی ویفاقەکان ئەگەری نزیکە، ئەو ویفاقانە (بەهەردوو ئاڕاستەی ئیقلیمی و جیهانی) چارەنوسی کورد دیاری دەکەن، ڕوونتر ویفاقی ئیقلیمی زۆر زیان بەخشە، بەڵام کاتێک دەبێتە کارەسات کە

(4) لە ڕاپۆرتیکی (مفتش العام بوزاره الخارجیه الامریکیه رقم: isp-c11-08A ) باس لە بەدەولیکردنی پرسی کەرکوك دەکات (بۆ نەتەوە یەکگرتوەکان) کەچی سەرکردە کوردەکان رازی نەبووینە لەب ەرچاوچنۆکی بۆ فرۆشتنی نەوت، بەگوێرەی ئەو راپۆرتە دەسەڵاتی کوردی نەوت فرۆشتنی لا گرنگ تر بوە لە چارەنوسی کەرکوك.

ویفاقی ئیقلیمی تەبا دەبێت لەگەڵ ویفاقی نێودەوڵەتی، کاریگەریەکە بەسەر کورد (ئەرێنی یان نەرێنی) لێرە دێت، خوێندنەوەی کاریگەری (ناکۆکی ئەمریکی و تورکی و ئێرانی) بەسەر کورد، هەر ئەوەش پێوەری خوێندنەوەی کاریگەری و ئاسۆی چارەنوسی کوردستانە. سروشتی ویفاقی ئیقلیمی دژ بە ناوەڕۆکی ئاسایشی نەتەوەی کوردە، چونکە عادەتەن ئەو ویفاقە لەسەر ئەو بنەمایانەی خوارەوە بنیات دەنرێن، کە هەر بنەمایەک کاریگەری کۆمەڵێک ئاستەنگ و کۆسپ لە پێش بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد دەبێت:

أ. پیرۆزی سنوور - لە یاسای نێودەوڵەتی و (مبدء عدم التدخل).
ب. بەرژەوەندی هاوبەشی ئەو وولاتانەی کوردیان بەسەر دابەش کراوە گەورەتربووە لە ناکۆکیەکانیان بەرامبەر چارەنووسی کورد.
ج. بە هێزی دەسەلاتی ناوەندی.
د. لایەنگیری جیهانی بۆ ئەو دەسەلاتانە.

**لەکاتێکدا ئاسایشی نەتەوەیی کورد وا دەخوازێت کە:**

١- بەرپانەبوونی هاوپەیمانی و هاریکاری ئیقلیمی (ویفاق ئیقلیمی).
٢- بەرپانەبوونی گونجان لە نێوان ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانەی کوردستان و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی.
٣- هەر گۆڕانکارییەک کە ئەو نەخشە سیاسیە تێکبدا کە لە (سایکس بیکۆ) دروست بووە.
٤- هەر گۆرانکارییەک تیایدا سەروەری سنور و ئارامی نێودەوڵەتی لەسەر بنچینەی ئەو دیزاینەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست هەڵوەشێنیتەوە.
٥- زاڵبوونی ئایدیۆلۆژیا و مەبادیئ بەسەر بەرژەوەندی.
٦- دروستنەبوونی کۆمەڵگەی مەدەنی لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی مادی.

بەپێی ئاڵۆزی رۆژهەلاتی ناوەڕاست بە دەگمەن ئەو ویفاقانە لە بەرژەوەندی گشتی روودەدات، وەک بنەمای (مارکۆز) بەیەکگەیشتنی دوولا عادەتەن لەسەر حیسابی

سێیەمە، لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست (سێیەم) ئەلقە لاوازەکەیە، بۆیە زۆربەی جاریش لەسەر حیسابی میللەتانی چەوساوە و ژێردەستەکان بووە، کورد یەکێک بووە لەو ئەلقەیە لاوازە، تا وڵاتە داگیرکەرانی کوردستان ئارام و پتەو بن لە ناوەخۆ و لەپەیوەندیەکی باشیش بن لەگەڵ لایەنە ئیقلیمی و نێودەوڵەتییەکان، ئەوا زیاتر کورد خنکاو دەبێت. دەبێت مونەزیر و بڕیاری کورد ئەوە بزانن دیسان جۆرێک لە دوو جەمسەری خەریکە بێتە کایەوە، لە نێوان روسیا و ئەمریکا، بەڵام ئەمجارەیان دوو جەمسەریەکە گەردوونی نییە، هەر ٧ کیشوەر ناگرێتەوە، لەسەر ئاستی یەک کیشوەرە ئەویش (ئاسیا)یە. بریجنسکی لە کتێبی (رقعة الشطرنج الکبری السیطره الامریکیه و مایترتب علیها جیواستراتیجیا) بەشی دووەمی تەرخان کردووە بۆ مەترسییەکانی (پرۆژەی ئۆراسیا) و سەرهەڵدانەوەی جەمسەری دووەم و جەنگی سارد، بۆیە کارنامەی ستراتیژی کورد دیسان کەوتۆتەوە زەحمەتی و قورسی، بە پێچەوانەوە دیسان وڵاتانی ئیقلیمی بارودۆخیان تا ڕادەیەک باش دەبێتەوە و دیزاینی سایکس پیکۆ پتەو دەبێتەوە، بۆیە ناکرێت و نابێت سەرکردەی شارەزا پشتیوانە نێودەوڵەتیەکان بگۆڕێتەوە بە ئیقلیمی، هەڵبەتە لە ئیقلیمیش پۆلێن هەیە.

ئەو بانگەشەی تورکیا بۆ (عوسمانی نوێ) پاشەکشەی کرد بۆ (تەنازول بۆ گەورەکان و ستەم لە بچوکەکان)، (تیۆری سفر لەگەڵ بەهێزەکان و فول ناکۆکیش لەگەڵ بێهێزەکان)، پرۆژەی تورکیا بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەو دەمە قەتیس بووە لە پیلان دژی کورد لە هەر شوێنێک هەبێت، لە ڕاستیدا ئەو جموجوڵەی کورد بەتایبەتی لە باشور بریتیە لە سیاسەتکردنێکی بەقەدەر و زیاتریش بەڕوانگەیەکی زۆر تەسکی حزبی و شەخسی دەکرێت، بەپێی ئەو توێژینەوەیە، لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دۆست زۆر کەمە، بەڵام ئەوە ناکات تورکیا و ئیسرائیل و ئێران و سعودیە بە عیبارەیەکی پۆپولەری ڕێز بکەین بڵێین (هەمویان یەک لە یەک خراپترن)، ئەوە کاری توێژینەوە نییە، دەبێت پۆڵێنیان بکەین، هەریەکەو پلەی خۆی هەیە، تورکیا دژ بە کوردە، ئەوەی سعودیە دژ بە شیعە و ئێرانە، تەنانەت (محمد بن سلمان- ولی عهدی

سعودی) لە ٢٠١٨/٣/٢٥ ئەوەی ئاشکرا کرد بۆ ( واشنتۆن پۆست) کە سعودیە لەبەر خاتری بەرژەوەندی ئەمریکا وەهابیەتی زیندو کردەوە (وەهابیەت بەرامبەر شیعە)، ئەوەی ئێران کۆکردنەوەی شیعەیە لە کۆمکارێکی بەهێز، ئاڕاستەکان تەک و لۆنە، ئینجا دەبێت بزانین ئەو ئاڕاستانە بەرەو کوێن، کاملا ساغبووەتەوە کاملا مناوەرە دەکات، ئێران ساغبووەتەوە دژ بە بەرژەوەندی ئەمریکایە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئیتر ناگونجێت لەگەڵ بەرەی ئەمریکی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، تورکیاش لەو وەرچەرخانەدایە، دەتوانین بڵێین ئیسلامی رادیکالی (سوننە و شیعە) ساغبوونەتەوە کە تا ڕادەیەک زەمینەیەکی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گونجاو بۆ کورد دروست دەکەن، نە ئێران نە تورکیا لەیەك کاتدا ناتوانن بەرنامە و پرۆژەی خۆیان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئیدارە بدەن و لە هەمانکاتیشدا لە ململانێش بن لەگەڵ ئەمریکا، (پێکەوەیان پێناکرێت)، بۆیە بەو دۆخە دۆمەینی فراوانبوونی ئێران هەر ئەوەندەیە و زیاتر نابێت.

دەبێت ئەوەش بزانین تورکیا و ئێران بۆ خۆیانی دەکەن، بەڵام دەبێت کورد سود وەرگرێت، کەچی تا ڕادەیەک بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد تووشی دابەشی بووە بەسەر ئەو ئاڕاستانە، ڕاستە زۆر بە ئاسانی ستراتیژیەتی کورد و (بنەماکانی ئاسایشی نەتەوەیی کورد) دیاری ناکرێت، بۆیە سەرکردایەتی کورد تووشی ئەوبەر و ئەمبەر بووە، زیانی زۆر گەورە بەر بزوتنەوەی کورد کەوت، دەبوایە نەخشە ڕێگەیەکی یەکگرتوو هەبوایە گوزارشتی لە سیاسەتی گشتی کوردستان بکردایە، ئەوە نەبووە و تا ئەم ساتەش نیە، لەبەر ئەوەی هێشتا ناوەندێک نییە بۆ تێڕوانینی هاوبەش سەبارەت بە دیبلۆماسیەتی دەرەوە، بەڵکو هێشتا ڕوانگەی حیزبی بەکارە، یان ڕوانگەیەکی موخابەراتی کلاسیکی، لەو ڕووەشەوە زۆرجار لایەنە کوردستانیەکان جۆرە دابەشبوونێکی تر لە بەرەی دیبلۆماسی و پەیوەندییەکانیان بەدی دەکرێت، ڕوانگەی جیاواز و چالاکی دیبلۆماسی جیاوازی بۆ دروست دەبێت، لە ئەنجامدا هەر

لایەن و لەگەڵ چەند وڵات و تەوەرە نێودەوڵەتیەکان نزیک دەبێتەوە، بانگەشەی ئەوەش دەکات و دەڵێت ئەوە لەبەرژەوەندی کوردە.

لەلای تورکیا لەهەوڵی ئەوەدایە ئەو سزاو هەڵمەتەی وا ڕووبەڕووی دەبێتەوە نەبێتە هۆی خۆبەدەستەوەدانی خواستی ئەمریکی، بە دوای بەدیلە لەگەڵ روسیا و ئێران و هەلی تریش، زۆر سەرکەوتوو نەبووە، کەچی سەرکردایەتی باشوری کوردستانیش لاسای تورکیا دەکاتەوە، لە روسیا و ئێران نزیک دەبێتەوە بەتاکتیکی، ئەگەر بۆ تورکیا کەمێک گونجاو بێت ئەوا بۆ کورد زۆر دوورە، دیسان جۆرە زیانێکی تر بەر کورد دەکەوێت و ئەو دەرفەتانە بێسود ڕەت دەبێت. ئەگەر لەو دەمە سەرکردایەتیەکی نوێ و شارەزا لە کوردستان بێنە پێشەوە، سەرکردە کۆنەکانیش هەر بمێنن بۆ ڕاوێژ، بوار هەیە کاری زۆر گەورە بکرێت لە ژێر سایەی ئەو ناکۆکیانەی ئەمریکا لەگەڵ وڵاتانی ناوچەکە هەیەتی، لەگەڵ ئێران بە پلەیەکی توند، ئینجا تورکیا، لەکەنداویش ناکۆکی بەرەی قەتەری و تورکی لەلایەک و بەرەی سعودیە و ئیمارات لەلایەکی تر لەگەڵ زۆر فاکتەری تری کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوری و فەرهەنگی کوردستان گونجاوە بۆ دروستبوونی پەیوەندیەکی ستراتیژی بەدیل بۆ ئەو وڵاتانە، ئەوە پرۆژەیەی ناوچەی ئارام بۆ رۆژئاڤا و 12 بنکەی ئەمریکی نیمچە بەدیلە بۆ ئەنجەرلیك، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نییە کوردستان دەبێتە بنکەی ئەمریکا و رۆژئاوا بۆ لێدانی ئێران و تورکیا و وڵاتانی تر. کورد نابێت نزیك مورتەزەقەیی بکەوێت، بەهیچ جۆرێک، بەڵکو دەبێتە بەشێک لە ئارامی و برایەتی هەر سێ میللەتی (عەرەبی - تورکی - فارسی) لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، هەروەها دەبێت ئاشتیش لەگەڵ باقی میللەتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەرپا بکات.

دەبێت کورد ئەوە بزانێت ئەگەر بەو ئاڕاستەی ئێستای پێگەی هەروا دابەزێ بۆ دۆخی سەدەی بیستەم و تەنها تەعامولی مرۆیی لەگەڵ بکرێت ئەوا ئەو تەعامولە لای (ئەمریکای نوێ) زۆر لاوازە، بە جۆرێك لە جۆرەکان (سیاسەتی ترامپ) کەمتر ڕەچاوی مرۆیی تێدایە، کوردستان لە چوارچێوەی مرۆیی بپەڕێتەوە بۆ سیاسی و

یاسایی و هەتا سەربازیش، بەڵام پیلانی گەورەش هەیە بۆ گێڕانەوەی پرسی کورد لەو ئاستە بەرزە بۆ پرسێکی مرۆیی-بەتایبەتی سیاسەتی ئیحتوای تورکی، سەرکردایەتی ئێستای کوردیش (بەتایبەتی لەباشور) ئیدارەی ململانێ زۆر لاوازە، بۆیە مەترسی ئەو گەڕانەوە هەیە، خۆ ئەگەر بگەڕێتەوە دۆخی مرۆیی ئەوا بەیەکجار زۆر لە ئاسۆی نێودەوڵەتی دادەبڕێت .

لەلایەکیتریش لە توێژینەوەکەی (راند) و سیاسەتی نوێی ترامپیش دوو ئامرازی تێدایە زۆر ئاڵۆزە (ناکۆکیشن بۆ کورد)، یەکەمیان، بەکارهێنانی (خصومە) ئەوا کورد دەگرێتەوە، ئەوەی تریان بەکارهێنانی (هاوپەیمانانە) دوژمنانی کورد دەگرێتەوە لە ناوچەکە، کەواتە کارکردن لەو ناوەندە بۆ سەرکردایەتی کورد ئاسان نییە، بەتایبەتی ئێستا ڕۆژئاوا و ئەمریکا ڕوانینیان بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەك سەردەمی دارشتنەوەی سایکس پیکۆ نییە، جۆرە ئامانجێکی تر لەلایەن رۆژئاوا و ئەمریکا لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەدی دەکرێت، وەك (پاراستنی ئارامی و فراوانکردنی بازاڕ و زامنی نەوت و پاراستنی دۆستەکان و دیزاینی کلاسیکی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاسایشی ئیسرائیل و سەرهەڵنەدانی هێزی تیرۆر و دەوڵەتی رادیکالی و....هتد، ئەوانە هەموی توێژینەوە و شارەزایی وردی دەوێت، ئەزمون و نەخشەی ستراتیژی دەوێت، عەقڵێکی مودەبەری دەوێت. جا نازانرێت بەو بێسەروبەریەی کورد و بێ گوێدانە توێژینەوە و بەو هەموو گەندەڵیەوە چۆن لەو هەورازە سەختە سەردەکەون؟

**ئایا ستر اتیژیەتی حزبی کوردی چییە؟**

بەکورتی حزبەکانی دەسەڵاتی کوردی باشور و تاڕادەیەکیش حزبەکانی پارچەکانی تری کوردستان هەمو ستراتیژیان ئەو کلاشنکۆفەیە کە لە دەستیانە، خۆ وەسفی نێودەوڵەتیش بۆ کورد هەر گوتویانە، "شەڕکەری چاکن"، چۆن حوکمی حزبی کوردستانی چەکدار دەتوانی ستراتیژیەك بەرجەستە بکات لە ژێر سایەی (بنەمای ترامپ) کە (اقتصاد- اخضاع دون الحرب- امریکا اولا)، حزبی کوردی زیاتر مەیلی

بەلای چەکی سادە (کلا شنکۆف) و میراتی سەدەی بیستە، لەکاتێکدا وڵاتانی دەوروبەر تەکنۆلۆجیای چەکیان گەیشتە ڕادەی لێزەر و بەکارهێنانی مەدار جیۆسی، ئەوە لەکاتێکایە (یاسای حیزبەکان لە کوردستان، دەستوری عیراق و ئیرادەی نێودەوڵەتی) ڕێگە بە حزبی چەکدار نادەن، کەواتە دەبێت سەرکردایەتی کورد پێناسەی تازە بۆ چەك دابڕێژێت، بەکارهێنانی چەك لای کورد دەبێتە کارەسات، ئەگەر هاتوو ئەو کارانە نەکرێت:

1. چەك لە دەست حزب و شەخس نەمێنێت ببێتە دەزگای نیشتمانی، ئەگینا یان بەکارت ناهێنن یان بەکاریشیان هێنای وەك مورتەزەقە کارت لەگەڵ دەکان.
2. ئەو چەکە ئەو کاتە بەکاربێت کە لە چوارچێوەی هاوپەیمانی نێودەوڵەتی بێت.
3. ئەو هاوپەیمانیە وابکرێت کە هەر سەربازی نەبێت، بەڵکو قوڵبێتەوە بۆ هاوپەیمانی ستراتیژی و سیاسی و یاسایی، کە لە ژێر سایەی توێژینەوەی (ثینك تانکی) بێ و، زۆر خالی تر.

بەکورتیەکەی ئەو جۆرە چەکداریەی حزبی کوردی سەردەمی نەماوە، بەتایبەتی لە سیاسەتی ترامپ، تەعامولی مورتەزەقەیی دەکرێت ئەگەر ئەو (3) خاڵەی سەروو جێبەجێ نەکرێت، ئەگەر هەروا چەك لە دەستی حزب و شەخس بێت دەبێتە مورتەزەقەی ئیقلیمی و نێودەوڵەتی، هەروەك زۆربەی جار وابووە، ئەگەر بیکەیتە موئەسەساتی راستەقینە چارەنوسی کوردستانی پێ دروست دەبێت، ئەزمونەکانی نوێ پێمان دەڵێت (چەکی کوردی) زیاتر بە مورتەزەقەیی بەکارهاتوە (لەگەڵ ئێران و تورکیا) تەنانەت لەگەڵ نێودەوڵەتیش، لەگرتنەوەی موسل کورد تەنها داوای (415 ملیۆن دۆلاری) کردوە، کوردی رۆژئاڤا تاڕادەیەك باشترن، بەڵام هێشتا دەبێت وردتر بن، ئامۆژگاری بۆ کوردی رۆژهەڵات بەخێرایی ئەو فرە چەکداریە (کۆمەڵێ حزبی دور لەیەك) چارەسەر بکەن، هەر حزبێك چەکی خۆی هەبێت لە باشوری کوردستان ئەزمونێکە بوتە کارەسات و پارێزگاری کوردستانیشیان پێ ناکرێت. سوپای عێراق و تورکیا و ئێران بەکەیفی خۆیان جموجۆڵ و (تەڕادانێ) لە ناو کوردستان دەکەن.

# سەرچاوەکان

1- مؤسسة الراند: العلاقات التركيه الايرانيه بات متغيرا، 2013 .

2- بەشی ana yasa دەقی دەستوری هەمووارکراو siyasi rehber بە بڕیاری ژ:٢٧٠٩ی ٧-١١-١٩٨٢ لە ل٣ ەوە تۆمارکردوە.

3- وزارة الخارجية البريطانية دائرة الشرق الأدنى-تركية E] ٦٥/٩٦/٣٥٥٣ [سرى للغاية من سير ايج رامبولد الى:ماركويس كوزون كيدلستون رقم التقرير ٣.٨

4- لينين -المؤلفات الكاملة: "خلاصة المناقشة حول حق الأمم في تقرير مصيرها بنفسها.

5- العمق الاستراتيجى، احمد داود اوغلو، ترجمة محمد جابر ثلجى و طارق عبدالجليل، مراجعة بشير نافع و برهان كوروغلو، دار العربية للعلوم ناشرون، مركز الجزيرة للدراسات، الطبعه الاولى، ٢٠١٠.

6- Ryne A. Sherman, The Personality of Donald Trump, Sep 17, 2015.
<https://www.psychologytoday.com/us/blog/the-situation-lab/201509/the-personality-donald-trump>

7-Amanda Sloat, How to Save the U.S.-Turkey Relationship, foreign affairs, July 30, 2018.
<https://www.foreignaffairs.com/articles/europe/2018-07-30/how-save-us-turkey-relationship>

The Kurds in the New Transformations in the Middle East

# The nature of the relations between USA, Iran and Turkey and its impact on the Kurdistan

Kurd di Guhertinên Nû yên Rojhilata Navîn

xwezayî ya têkiliyên navbera Amerîka, Îran û Trkiye û bandora wê li ser Kurdistanê

ئێستا زیاتر لە جاران پەیوەندییەکانی (ئەمریکا، تورکیا و ئێران) ڕوو لە خراپی و ئاڵۆزییە، ئەوەی تازە بێ لەو گۆڕانکاریانە بریتیە لە، سزای ئابووری بەسەر (تورکیا و ئێران) وەک بەشێک لە سیاسەتێکی نوێی جیهانیی کە پێی دەڵێن، (ارغام دون الحرب)، ئەو جۆرە سیاسەتەش دیزاینێکی نوێ لە پەیوەندی نێودەوڵەتی و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دروست دەکات، کاریگەرییەکی قووڵیش لەسەر پیگەی کورد و کوردستان دروست دەکات، بەهەردوو ئاراستەی (ئەرێنی و نەرێنی) لەو ڕاپۆرتە ستراتیجیە هەوڵدەدەین هەندێ لایەنی ئەو کاریگەریانە لە ئێستاوە دەرخەین، بۆ ئەوەی کوردستان لە ئەرینیەکان سودمەند بێت و خۆشی لە نەرینیەکان بپارێزێت.




بۆردی توێژینەوەی دەزگای ستاندەر